سەرپەرشتی گشتی

شێرکۆ بێکەس

بەڕێوەبەری ڕۆڤار

دڵشاد عەبدوڵڵا

سکرتێری ڕۆڤار

یاسین عومەر

سەرپەرشتیاری هونەری

قادر میرخان

هەڵەچنی

ناسك عەزیز محمد

مونتاجی کۆمپیوتەر

ئاسۆ سەعید


# ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

1-ئیبراهیم ئەحمەد

2-محەمەد مەولود (مەم)

3-کەمال مەزهەر

4-لەتیف حامد

5-سوارەی ئیلخانی زادە

6-محێدین زەنگەنە

7-ئەحمەد هەردی

8-یەڵماز گۆنای

9-محەرەم محەمەد ئەمین

10-دڵدار

11-مەستورەی ئەردەڵانی

12-مەولانا خالیدی نەقشبەندی

13-جەمال عیرفان

14-مەلا عەبدولکەریمی مودەریس

15-جەلالی میرزا کەریم

16-ئیسماعیل بێشکچی

17-عەبدول خالق مەعروف

18-هێمن

19-حسێن حوزنی موکریان

20-ئەمین فەیزی بەگ

21-کامەران موکری

22-جەلال تەقی



ساڵی 1978 لە سلێمانی لەگەڕەکی کانێسکان لە دایك بووە.

ساڵی 1996 بەشی وێنەکێشانی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی تەواوکردوە.

ساڵی 1994 یەکەمین پێشانگای تایبەتی خۆی لە هۆڵی پەیمانگە کردۆتەوە.

ساڵی 1994 دووەمین پێشانگای تایبەتی خۆی لەهۆڵی بازرگانی سلێمانی کردۆتەوە، هەمان بەرهەم دوبارە لە هۆڵی میدیای هەولێر بۆ جاری دووەم نمایش کراوەتەوە.

ساڵی 1998 سێیەمین پێشانگەی تایبەتی خۆی لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی کردۆتەوە.

ساڵی 1999 بەهاوبەشی لەگەڵ بەهادینی شێخ کەریم پێشانگایەکیان لە هۆڵی مەڵبەندی لاوانی میدیا لە سلێمانی کردۆتەوە.

ساڵی 2000 چوارەمین پێشانگای تایبەتی خۆی لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی پێشکەش کردوە.

لە یەکێ لە ئێوارەکانی هاوینی ساڵی 2000و لە سروتێکی وروژێنەرئامێزدا لەگەڵ ڕەهێڵ عەبدولجەبارو بەهادینی شێخ کەریمدا لە سەهۆڵەکەی سلێمانی پێشانگایەکی هاوبەشیان ئەنجام، کە چەند ساتێك دواتر یەکە یەکەی تابلۆکانیان سوتاند.

## ژمارەکانی داهاتوو تایبەتن بە:

-هەژار موکریانی

-عەلی ئەشرەف دەروێشیان

-عەلی مەردان

-شاکر فەتاح


(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیریە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەر دوو مانگ جارێك دەریدەکات

ناونیشان

سلێمانی -فولکەی یەکگرتن -دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ڕۆڤار ت / 3120690

لەدەرەوەی کوردستان Tel: 00441628477660 - Fax: 00441628486008

E-mail.

www.sardam.net\web mail

چاپخانەی (ڕەنج)

# دیلانی مرۆڤ*

د. دڵشاد عەلی

**1-بنەماڵەی دیلان:**

دیلانی مرۆڤ (حەمە ساڵحی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا ساڵحی کوڕی مەلا قادری شەوخوێن)ە، بنەماڵەی (مەلا قادری شەوخوێن)، بنەماڵەیەکی کۆنی شاری سلێمانین و پشتاوپشت لەگەڵ مێژووی هاتونەهاتی شارەکەدا ئاوێتە بوون.

(مەلا قادر) نابینایەکی زگماک و دەنگخۆش و قورئان خوێنێکی دیاری سەردەمەکەی بووە. دایکی (مەلا قادر) کچی (ئەوڕەحمان گردە)ی خزمی (مەحموود پاشای بابان) بووە. ئەم خزمایەتییە لە لایەک و دەنگخۆشییەکەی مەلا قادری شەوخوێن لە لایەکی ترەوە، بوونەتە هۆی ئەوەی لە پاشاکانی بابانی نزیک بخەنەوە و یەکێ لەو پاشایانە کە (مەحموود پاشای بابان) بووە، دوو دوکان و خانوویەکی لە گەڕەکی گاورانی سلێمانی پێشکەش بکات. هەر ئەم تێکەڵاوی و خۆشەویستییەی نێوان مەلا قادر و پاشاکانی بابان، وای لە مەلا قادریش کردووە، شەوانە دەستی (ئامینەی مەلا)ی کوڕەزای بگرێ و بچێتە سەر گۆڕەکەی (سلیمان پاشای بابان) و قورئانی لەسەر بخوێنێ، بەم وەفاکردارییەش نازناوی (شەوخوێن)ی پێ ببەخشرێ.

مەلا قادری شەوخوێن دوو کوڕی هەبووە، (مەلا ساڵح و مەلا سەعید)، مەلا سەعیدیان باوکی (ئامینەی مەلا)ی دایکی (وەستا عەلی خەیات)ە، هەرچی مەلا ساڵحیش بووە، ئەوا ئەمیان (وەتراخچی) بووە و دوکانەکەی لە نزیک خومخانەچییەکانی زووی شاری سلێمانییەوە بووە، وەك دیلان باسی دەکات: "مەلا ساڵح پیاوێکی قسەخۆش و سەروزمان شیرین بووە و هەموو جۆرە خەسڵەتێکی پیاوێکی کۆنی شاری سلێمانی تێدا بووە، ئەویش وەك (مەلا قادر)ی باوکی دەنگخۆش بووە، بەڵام تەنها لە بانگ و سەڵادا بەکاری هێناوە".

(مەلا ساڵح) لە (پیرۆز)ی خێزانی کە کچی (فاتمە جوانێ)یە و لە بنەماڵەی (ئەولا هەڵەبجەیی)یە، تەنها (مەلا ئەحمەدی دیلان)ی بووە.

مەلا ئەحمەدی دیلان مرۆڤێك بووە لە مرۆڤە ناسراو و دیارەکانی شاری سلێمانی و خۆشەویستی هەمووان بووە. ئەم



ناسراوی و ناوبانگ و ئامادەبوونە کۆمەڵایەتییەشی لەناو خەڵکی شارەکەیدا ئاکامی کۆمەڵێ بەهرە و لێهاتوویی بووە، یەکێ لەو بەهرانەش دەنگ خۆشییەکەی بووە و لای دەستە و توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵەکەی خۆشەویستی کردبوو. لە لایەك بانگ و سەڵا زوڵاڵەکەی ناوبانگێکی وای دابوو پێی کە لە یاد نەچێت، بۆیە (قادر برسی) لەو شیعرەیدا کە بە ناونیشانی (ناودارانی سلێمانی)یە دەربارەی دەڵێ: "خاوەن دەنگ و سەڵای خۆش.. مەلا ئەحمەدی دیلان" لە لایەکی ترەوە هەرکاتێ ناوی هونەرمەندە دەنگخۆشەکانی شاری سلێمانی هاتبێتە ناوەوە، ناوی (مەلا ئەحمەدی دیلان)یش شانبەشانی ناوی (مەلا کەریم) هاتووە، تەنانەت لە لاپەڕەی یادگاری و ئەو سەیرانە بەناوبانگەی کە قەسابەکانی شاری سلێمانی لە ساڵی 1928دا لە سەرچنار سازیان کردووە، ناوی (مەلا ئەحمەدی دیلان) بە نەمری ماوەتەوە، بەوپێیەی لەگەڵ (حاجی مەلا فەرەجی بەقاڵ)دا: "بە گۆرانی سەیرانەکەیان خۆش کردبوو". وەنەبێ ئەم بەهرەیەی مەلا ئەحمەدی دیلان هەر لە تافی لاوێتییەکەیدا ناوبانگی پێدابێ و هەر لە گەنجێتییەکەیدا شەیدای گۆرانی بووبێ بەڵکو وەك (دیلان)ی شاعیر دەڵێ: "لە پیریشا لە هەموو دانیشتنێکا ئاگر خۆشکەر و ئاهەنگ گەرمکەر بووە". هەر لەپاڵ ئەو بەهرەی دەنگخۆشییەیدا، مەلا ئەحمەدی دیلان، یەکێك بووە لەو مرۆڤانەی کە بە (قسەخۆش) ناسرابوون و لەم بوارەشدا هەرکاتێ ناوی (پیاوی قسەخۆش)ی شاری سلێمانی هێنرابێ، ناوی ئەویش لە

ڕیزی ئەو سەدان ناوەدا بووە کە ناوی "شێخ مەحموودی نەمر" لە سەرووییانەوە بووە.

سەرباری هەموو ئەو بەهرانەی (مەلا ئەحمەدی دیلان)، وەك خوێندەوارێکی وشیار و خەتخۆش و ئەدەبدۆستێکی شارەزا و فارسیزانێکی چاکی سەردەمەکەشی، لەناو ڕۆشنبیران و ڕووناکبیرانی ئەو قۆناغەدا، ناسراو بووە، بە تایبەتیش لەو ڕووەوە کە شارەزاییەکی باشی لە (حافز و سەعدی و شیرازی و نیزامی گەنجەوی)دا هەبووە و زۆر کەس بۆ لێکدانەوەی شیعری ئەو شاعیرە بەناوبانگانەی ئەدەبی فارسی، ڕوویان تێکردووە، هەر بەم شارەزاییەشییەوە، لە کۆڕ و دانیشتنە ئەدەبییەکانی شێخ بابا عەلی و حاجی مەلا سەعیدی کەرکوکیدا، بە لێهاتوویییەوە کۆڕ گەرمکەر بوو.

وە نەبێ ئەم لایەنە گەشانەی ژیانی (مەلا ئەحمەدی دیلان)، ئاکامی دەستڕۆیشتووی و سەرچاوەیەکی بژێوی چەسپاو بووبێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە گەڵاڵەبووی مێشك و بازووی ڕەنجدەرێکی وابووە کە زۆر جار بژێوی ژیان ناچاری کردووە دوور لە خێزانەکەی، ڕووبکاتە دێی (بەشارەت)ی هەڵەبجە و لەوێ خەریکی تووتن کردن بێت. ئەم مرۆڤە هونەرمەند و ڕووناکبیر و ڕەنجدەرە لە ساڵی (1955)دا، لە سلێمانی و بێ دیدەنی (حەمە ساڵح دیلان)ی کوڕی، کە لە (نوگرە سەلمان) دەستبەسەر بووە، چاوی لێکناوە و کۆچی دوایی کردووە. دەربارەی ئەم کۆچکردنەی (مەلا ئەحمەدی دیلان)یش، دیلانی شاعیر بە حەسرەتەوە لاپەڕەی ئەو یادە هەڵدەداتەوە و دەڵێ: "پاش ساڵێ زانیم باوکم چووەتە ژێر دار ئەرخەوانەکەی بەردەمی شێخ مارف، بە ڕووکاری گەڕەکی (گاوران)ی خۆما".

لێرەدا جێگای خۆیەتی کە ئاورێك لە نازناوەکەی (مەلا ئەحمەدی دیلان)یش بدەینەوە. دیلانی شاعیر دەربارەی ئەم نازناوەی خۆی و باوکی دەڵێ: "وشەی (دیلان) ئەگەڕێتەوە بۆ باوکم، مەلا ئەحمەد بە منداڵی دایکی زۆری خۆش ویستووە، لە پێشا پێی وتووە (دڵ)، ئینجا بووە بە (دڵان)، پاشان بووە بە (دلان)، دواجار بە (دیلان)، کە لە دڵەوە هاتووە و مەبەست خۆشەویستییە و منیش نازناوم لەوە جوانتر نەدۆزییەوە، بۆیە (دیلان)م کرد بە نازناوی خۆم، کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1944".

بەلای ئێمەوە ئەم چەشنە ڕاڤەکردنەی وشەی (دیلان) ڕاست نییە و ناتوانین لێی وەرگرین، چونکە ئەگەر قەناعەتیشمان بەوە کرد کە ئەو نازناوە لە (دڵ)ەوە هاتووە و مەبەست خۆشەویستی بووە، ئەوا ناشێ لە وشەی (دڵ)ی کوردییەوە وەرگیرابێ، بەڵکو دەشێ لە وشەی (دیل)ی فارسییەوە بووبێ، کە یەکێ لە واتاکانی (دڵ)ی کوردی گەیاندووە.

لەگەڵ ئەوەشدا، بە بۆچوونی ئێمە نازناوەکەی (مەلا ئەحمەد) هەمان وشەی (دیلان)ی کوردییە، کە یەکێ لە واتاکانی گۆرانی و بەزم و ڕەزمی گەیاندووە.

بە واتایەکی تر دەنگخۆشی و ئاهەنگ گێڕییەکەی (مەلا ئەحمەد) ئەو نازناوەی هێناوەتە پاڵ ناوەکەی، جا کردەی خۆی بووبێ یا یەکێکی تر، هەرچی ئەو ڕایەی (دیلان)ی شاعیریشە ئەوا بە مەبەست بووە و ئاکامی ئەو هەڵوێستەی بووە کە بەرامبەر دەنگخۆشییەکەی خۆشی و گۆرانییەکانی گرتبوویە بەر و بەردەوام هەوڵی ئەوەی ئەدا لە یاد و بیری خەڵکیدا نەمێنن و ئەوەشی تۆمار کراوە بیانسڕێتەوە.

لە لقێك لە لقەکانی ئەو بنەماڵە دێرینەی شاری سلێمانی، لە (مەلا ئەحمەدی دیلان) و (فاتمە)ی خێزانی، کە کچی (محەمەدی کوڕی ئەفراسیا)یە و باپیری خەڵکی گوێژە کوێرەی نزیك مەریوان بوە و بە هۆی دوژمنایەتییەوە، هاتۆتە دێی ئاوکە، (حەمە ساڵح دیلان)ی شاعیر لە ساڵی (1927)دا و لە گەڕەکی (گاوران)ی سلێمانی، لەدایك دەبێت جگە لە (قادر دیلان)ی برا بچووکی، چەند خوشکێکیشی دەبێ، بەڵام ئەمان هەر بە منداڵی کۆچی دواییان کردووە بۆیە هەر خۆی و قادر دیلانی برای لەژێر باڵی دایك و باوکێکی میهرەباندا پەروەردە دەکرێن.

هەر لە منداڵییەوە و لەو کاتەوەی کە (دیلان) خۆی بە (چاوکەوتنە بەرپێ بینین) دایدەنێ، کۆتێك لە کۆتەکانی کۆمەڵە دواکەوتووەکەی کە هەژاری بووە، دەست و پێی بەستۆتەوە و ئازاری داوە، بەڵام وەك دەردەکەوێ، ئەوەی باری گرانی ئەو کۆتەی لا سووك کردووە، (مەلا ئەحمەد)ی باوکی بووە، کە بە قسە خۆشەکانی نەیهێشتووە ئەو باری هەژارییە بزەی خۆشییان بتەرێنێ، ئەم ڕاستییەش لەو وتەیەی (دیلان)دا بەدەست دەهێنرێ کە دەربارەی باوکی دەڵێ: "قسەخۆش بوو.. لە ناساغییەکەیدا جار جارێ قسەی بۆ ئەکردین، هەموومانی ئەهێنایە پێکەنین".

سەرباری ئەو ڕۆڵە گرنگەی مەلا ئەحمەدی باوکی، هەر ئەویش بووە کە وشیارانە نەیهێشتووە کۆت و پێوەندی نەخوێندەواری بکرێتە گەردنی کوڕەکانی، سەرەتا لە گەڕەکەکەی خۆیان و لە مزگەوتی شێخ بابا عەلی، (دیلان)ی خستۆتە بەر خوێندن و قورئانی پیرۆزی پێ خەتم کردووە، پاشانیش لە قوتابخانەی (خالدیە) خوێندنی سەرەتایی پێ تەواو کردووە، ڕاستی ئەم ڕۆڵ بینینەی مەلا ئەحمەد لە ژیانی خوێندەواری (دیلان)دا، کاتێ دەردەکەوێ کە سەرەتایی تەواو دەکات و دەیەوێ بچێتە ناوەندی، وا ڕێدەکەوێ کە لەو ساڵەدا 1940 باوکی لە سلێمانی نابێت و لە دێی (بەشارەت) خەریکی تووتن کردن دەبێ، کەسیش نابێ پێنج دیناری وەرگرتنەکەی لە ناوەندی بۆ بدات، بەو هۆیەوە ئەو ساڵە وەرناگیرێ، کاتێ باوکی دێتەوە و بەو ڕووداوە دەزانێ، زۆر سەرزەنشتی (کاکە عەلی) خزمییان دەکات و لێی تووڕە دەبێ

و پێی دەڵێ "پێنج دینارت بۆ ئەدا داخڵی مەکتەب بێ، خوا لێت قبوڵ نەکا".

هەرچۆنێ بێ بە پشتگیری و هاندانی باوکی تا پۆلی سێی ناوەندی دەخوێنێ، بەڵام باری هەژاری خێزانەکەی لەو ساڵانەدا ناچاری دەکەن دەست لە خوێندن هەڵگرێ و بە دوای کارێکدا بگەڕێ تا باری بژێوییان کەمێك چاك بکات. لەو ماوەیەدا و لە ساڵی (1946)دا، (بابا عەلی شێخ مەحمودی حەفید)، کە وەزیری ئابووری دەبێت، دێت بۆ سلێمانی، لە گەڕانەوەیدا دیلان لەگەڵ خۆیدا دەبا بۆ بەغدا و فەرمانی دامەزراندنی لە فەرمانگەی (ئینحساری توتنی سلێمانی) بۆ دەردەکات و دەیکات بە (مەئموور مەخزەن).

دیارە کە ئەم دامەزراندنەی دیلان لەو تەمەنەدا، لە ناچاریدا بووە، بۆیە دەڵێ: "وەزعی ئیقتیسادیمان تەواو نەبوو، لە ساڵی 1939دا ئەو پارەیەی کە باوکم هەیبوو خانووە کۆنەکانی پێ ڕووخاندوو خانووی تازەمان پێ دروست کردووە.. کە دامەزرام بە فەرمانبەر، تەمەنم لە (19) ساڵی تێنەئەپەڕی".

ئەو فەرمانبەرییە نابەدڵییەی دیلان لە 1948/5/5دا کۆتایی پێهێنراوە و بە هۆی (بەشداریکردنی لە خۆپیشاندانداو خوتبەدان تیایدا) بڕیاری دەرکردنی دراوە، ئەم دەرکردنەشی بە لاوە گرنگ نەبووە و گوێی نەداوەتێ. لە هەمان ساڵیشدا (نەجمەدین سائب)ی موتەسەریفی ئەو کاتەی سلێمانی (دیلان) و (کامەران) بانگ دەکات و بە نیازی دەستەمۆکردنیان، پێشنیاری ئەوەیان بۆ دەکات داواکاری بنووسن تا دایانبمەزرێنێتەوە، بەڵام هەردووکیان ڕازی نابن و پێشنیارەکەی ڕەت دەکەنەوە.

بەم ڕەنگە (دیلان) بێ کاری فەرمانبەری دەمێنێتەوە تا سەرەتای ساڵی (1958)، لەو کاتەدا (عبدالمطلب امين الهاشمي) موتەسەریفی سلێمانی و (ئەوڕەحمان موفتی) یاریدەدەری، دیلان بانگ دەکەن و ڕازی دەکەن کە داوکاری بنووسێ تا دایمەزرێننەوە، بەم شێوەیە لە (ئیدارەی محلی) سلێمانی بە (مەئموور مەخزەن) دادەمەزرێتەوە و لە پاش چەند پلەیەکی لێپرسراوێتی لە ساڵی 1986دا خۆی خانەنشین دەکات.

بەم جۆرە لە دوای خانەنشینکردنەکەشی لەناو ئەو خێزانەیدا کە لە کۆتایی ساڵی 1958ەوە پێکی هێنابوو لەگەڵ (ئەختەر) خانی هاوسەری و کچێك و سێ کوڕیدا ژیان بەسەر دەبات و وەك شاعیرێکی ناودار و کوردێکی ڕەسەنی خۆڕاگر، هەنگاو بەرەو چارەنووسی نەتەوەکەی هەڵدەنێ تا لە ڕۆژی یەکشەممەی ڕێکەوتی 1990/10/28دا بە سەدان هیوا و ئاواتەوە چاو لێکدەنێ و لەژێر دارئەرخەوانەکانی گردی سەیواندا بە خاك دەسپێررێ.

گومانی تێدا نییە کە ئەم بوارەی ژیانی دیلان، نەك هەر لە سووچ و لایەنەکانی تری ژیانی دانابڕێ، بەڵکو بە چەشنێ ئاوێتەی یەکتر دەبن کە دەبنە هۆ و ئەنجامی یەکتری، بۆیە ئەو تێبینییانەی لێرەدا بەدەست دەهێنرێ، دەیخەینە پاڵ ئەو سەرنجانەی کە لە ئەنجامی تێڕوانینی لایەنەکانی تری ژیانییەوە گەڵاڵە دەکرێن و بە هەموویان ئەو زەمینەیان پێکهێناوە کە تۆوی تاقیکردنەوە شیعرییەکانی دیلانیان لەسەر سەوز بوون.

**2-چوارچێوەی ژیانە کۆمەڵایەتییەکەی دیلان:**

لە چاو گێڕان و پشکنینماندا بە دوای ئەو بنەڕەت و بنەمایانەی کە بازنەی ژیانە کۆمەڵایەتییەکەی (دیلان)یان پێکهێناوە، ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی ئەو ڕاستییە دەبینەوە کە یەکەم هێڵی پەیوەندی بەستنی دیلان بە دەرەوەی خێزانەکەیەوە و بە کۆمەڵەکەیەوە، لە بنەماڵە و خێزانەکەیەوە ڕایەڵە دەکرێ و ڕەنگی بۆ دەڕێژرێ بە تایبەتیش لە ڕێگای مەلا ئەحمەدی باوکییەوە، بەوپێیەی ناودارییەکەی باوکی بۆ خۆی دەرگایەکی فراوان و ڕێڕەوێکی ئاواڵە بووە بۆ ئەو پەیوەندی کردنەی دیلان بە دەستە و توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵەکەیەوە. ئەمە سەرباری ئەوەی کە کەسی مەلا ئەحمەدی باوکی بۆ خۆی لەم ڕووەوە ڕۆڵێکی سەرەکی بینیوە، بەو پێیەی لە ڕێگای پشتگیری کردنی خواست و ئارەزووی کوڕەکانییەوە، بواری ئەو پەیوەندی بەستنەی بۆ فراوانتر کردبوون، بەشداریکردنی هەردوو کوڕەکەی لە جموجوڵی شانۆگەری شارەکەیاندا و ڕۆڵی دیاری (قادر دیلان) لە بزووتنەوەی هونەری مۆسیقای شارەکەیداو چالاکییە سیاسی و هونەری و شیعرییەکەی دیلانیش بۆ خۆی، گەواهی ئەو ڕاستییانەن.

هەر ئەو هێڵە سەرەتاییەی کە لە خێزانەکەی دیلانەوە ڕایەڵەکراو دیلانی گەیاندە کۆمەڵەکەی، بەرەبەرە بە توانا و لێهاتوویی خۆی و بە کۆمەڵێ چالاکی جۆراوجۆر، بە ڕادەیەك توندوتۆڵ کرا، کە نەك هەر کردییە ناودارێکی شارەکەی، بەڵکو بووە مرۆڤێکی زیندووی گەل و نەتەوەکەشی، جا پێش ئەوەی پەردە لەسەر ئەو چالاکییانەی هەڵدەینەوە، بە پێویستی دەزانین ئاوڕێك لەو بەها و نەریت و خووڕەوشتە کۆمەڵایەتییانە بدەینەوە کە (دیلان)ی شاعیریان لەسەر پەروەردە کرابوو، چونکە ئەو بەها کۆمەڵایەتییانە وەك چۆن ڕۆڵی سەرەکییان لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکەیدا بینیوە، هەر بەو جۆرەش لە بنیاتنانی تاقیکردنەوە شیعرییەکانیدا کاردانەوەی تەواوی خۆیان هەبووە.

تیشکێ لەو تیشکە ڕووناك و گەشانەی لە مێژووی بنەماڵەکەی (دیلان)ەوە سەردەردێنێ، ئەو تیشکەیە کە بە ڕوونی ئەوەمان بۆ دەردەخات کە (دیلان)ی شاعیریش هەروەك باووباپیرانی یەکێك بووە لەو کوڕوکاڵانەی شاری سلێمانی کە (ئەدمۆندز) دەربارەیان دەڵێت: "لە پێش هەموو شتێکدا لە باووباپیریانەوە گوێیان لەو سەرگوزشتە خۆش و ئەفسووناوییانەی ئەو ڕۆژانە بووە (ڕۆژانی میرنشینییەکەی بابان). سەردەمی سەربەخۆیی کورد.." جا دیلانیش وەك زۆربەی

کوڕوکاڵانی شارەکەی، لە گوێ ئاگردانی خانووەکەی گەڕەکی گاورانیان، کە یادگاری بابانەکان بووە بۆی، چیرۆکی ڕۆژانی ڕابردووی پڕ شکۆی شارەکەی کە پایتەختی میرنشینییەکەی بابان بووە، تۆوی خۆشەویستی گەڕەك و شار و کوردستان و کوردیان لەو ناخیدا ئاوداوە و نەشونمایان پێکردووە، جا هەروەك چۆن بە دەربڕینی دەستەواژەی (گەڕەکی گاورانی خۆما) لە لایەن دیلان خۆیەوە لایەنێکی ئەو خۆشەویستییەی دەردەخەن کە بەرامبەر گەڕەکەکەی هەیبووە، بە هەمان شێوە، شیعرەکەی ساڵی 1968یشی کە بە ناونیشانی (سلێمانی)یەوە تیایدا بە لاپەڕەی مێژووی ئەو شارەدا شۆڕدەبێتەوە، لایەنێکی تری ئەو ڕاستییەمان دەخاتە بەردەست، ڕاستی خۆشویستن و شانازیکردن بە شارەکەی و ڕاستی خەمخۆرییەکەی بۆی.

هەر ئەو داستانە شکۆمەندییەی (سلێمانی) کە بۆ (دیلان)ی مرۆڤ و شاعیر و هونەرمەند و سیاسی تۆیشووی سەفەری ژیان و هەوێنی داهێنان بووە، بووشەتە سەرچاوەی هەموو ئەو نەریت و خووڕەوشتە چاکانەی کە خەڵکی شار شانازییان پێوە کردووە و



پیاوی پیاوانەی بۆ پەروەردە کردوون، بە چەشنێ پووکانەوەی ئەو نەریت و ڕەوشتانە چرۆی خەم و پەژارەی لەلا کردوونەتەوە، لێرەدا کە سەرنج لەو وەسفەی دیلان دەدەین کە دەربارەی (مەلا ساڵحی) باپیرییەتی‌و دەڵێ: (هەموو جۆرە خەسڵەتێکی پیاوێکی کۆنی شاری سلێمانی تێدا بووە) دەگەینە ئەو ئاکامەی کە ئەم وتەیەی (مەلا برایم) ناوێکی سلێمانی بۆ خۆی زمانحاڵی (دیلان)یش بووە: "ئەوسا شارەکەمان لە گەڵێ ڕووەوە دواکەوتوو بوو، بەڵام ئێستا لە زۆر ڕووەوە پێشکەوتوو و ڕازاوەیە، و هۆی حەسانەوە و کات بەسەربردنی زۆرە، بەڵام داخەکەم ئێستە، ئەگەرچی خوێندەواری زۆرە، بەڵام وەفاداری کەمە، شەقامەکان پاکن، بەڵام زۆر دڵپیسین، خواردنی خۆش و هۆی حەسانەوە هەیە، بەڵام دەرامەت کزە و دەردی دەروون زۆرە، ئەوسا دراوسێتی پیرۆزتر بوو، هاوڕێیەتی بەهێزتر بوو، پیاوەتی باوی بوو.."

جا هەر ئەو ڕەوشت و نەریتە چاکانەی شار بۆ دیلانیش بوونەتە بنەمای پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی و بەهاکەشیان بوە تۆوی گەڵێ لە تاقیکردنەوە شیعرییەکانی

شەوی جاران شەوگاری پایزی درێژ
تا سوورایی ئەپەڕییە چاوی گێژ و وێژ
ئەم وڵاتە پڕ لە پیت و پڕ سامانە
جێگای فەڕبوو پڕبوو لە شەقڵی پیاوانە

ڕەوشتێك لەو ڕەوشتە چاکانەی کە دیلانی لەسەر پەروەردە کرابوو، ئەمەکداری و وەفاداری بوو، بۆیە حەزی دەکرد لە دۆستەکانیشیدا ببینێ، بۆ خۆشی چاکە و پیاوەتی گەڵێ کەسی لەیاد بووە، یەکێ لەوانە (عەلی فەوتاو)ە کە دەربارەی دەڵێ: "کاتێ مەلا ئەحمەدی دیلان کۆچی دوایی کرد، عەلی فەوتاو تازێگر و سەرقەبران خۆشکەری بووە.. تەرمەکەی مەلا ئەحەدی دیلانی پیاوانە گەیانە ژێر دار ئەرخەوانەکەی بەردەمی شێخ مارف.."

ئازار و ئەشکەنجەی ژیانیش هیچ کاتێ ئەو کەسانەی لە بیر نەبردۆتەوە کە یارمەتییان داوە و بوونەتە پشتوپەنا بۆی، یەکێکیش لەو کەسانە (مەحمود هەمەوەندی)یە کە دیلان دەربارەی دەڵێ: "کە لە ڤێنا گەڕامەوە ئەمری گرتنم دەرچووبوو، یەك ساڵ لە بەغدا و کەرکووك و دێی دەرگەزێن و مورتکە لای مەحمود هەمەوەندی خۆم شاردەوە، زۆر خزمەتی کردم و لەبیرم ناچنەوە.. ژیان بۆ کوڕەکانی لە مورتکە". لە بواری ژیانە ئەدەبییەکەشیدا هاوڕێیەکی وەك (دکتۆر مارف خەزنەدار)ی هەر لە یادا دەمێنێ و دەربارەی دەنووسێ و دەڵێ: "یەکەم هاندەر و ئیشکەر و دڵسۆز و هاوڕێم مامۆستا مەعروف خەزنەدار بوو، هەر

بمێنێ لەگەڵ هاوڕێ ڕاستەقینەکانمدا.. تا ماوم سوپاسکاریم و برامە".

گومانی تێدا نییە ئەم خووڕەوشت و نەریتانەی دیلان، کە بۆ خۆیان پردێکی پتەویان پێکهێناوە و گەیاندوویانەتە ناوجەرگەی کۆمەڵەکەی، هیچ کاتێ لە ڕێڕەو و چالاکییە جۆربەجۆرەکانی ژیانی دانابڕێ، بەڵکو ڕۆڵی سەرەکیشیان بینیوە لەو چالاکییانەدا، بە واتایەکی تر هەروەك چۆن کەسێتی دیلانی مرۆڤیان داڕشتووە، هەر بەو جۆرەش دیلانی شاعیر و هونەرمەند و تێکۆشەریان پەروەردە کردووە.

**3-دیلانی هونەرمەند و دەنگخۆش:**

بوارێکی تر لەو بوارانەی دیلانیان گەیاندە ناوجەرگەی کۆمەڵ و نەتەوەکەی، "دەنگخۆش"ییەکەی و ئەو کۆمەڵە گۆرانییە بوو کە وەك هونەرمەندێکی ڕەسەن بە هونەر دۆستانیان ناساند، نەك هەر ئەوەندەش بەڵکو دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین کە لە زۆر کات و شوێندا هەر ئەو گۆرانیانەی بوون کە بە هەندێ دەستە و توێژی کۆمەڵەکەی ناساند و لە ڕێی ئەو گۆرانیانەیەوە دیلانی سیاسی و خەباتکەر و شاعیریان ناسییەوە، تەنانەت بە هۆی ئەو گۆرانیانەیەوە، بەشێکی گەورەی نەتەوەی کورد (گۆران)ی شاعیریشیان ناسیوە، ئەوەتا (عەبدولقادر دەباغی)، ڕاستگۆیانە پەردە لەسەر ئەو ڕاستییانە هەڵدەداتەوە و دەڵێ: "سێبەری شوومی دیکتاتۆری پاشایەتی بەسەر کوردستانی داگیرکراوی ئێراندا باڵی کێشابوو، زمان و ئەدەب و هونەر و دابونەریت و جلوبەرگی کوردی بە زۆرەملێ وەك دیاردەیەکی دواکەوتوویی ناسرابوو.. لەپڕ سرتەو چپەیەکی دڵخۆشکەر کەوتە نێو کۆمەڵانی نەتەوەی چاوەڕوانی کوردو تێکۆشەرانی نهێنی کاری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، کات و سات و درێژیی شەپۆلی بەشی کوردی ڕادیۆی قاهیرەی میسر بڵاوکردەوە، ئەو ماڵانەی ڕادیۆیان هەبوو، شەوانە بوونە ژوانگەی ئەویندارانی کوردستان و بزەیەکی ئومێد و خۆشی کەوتە سەرلێوان، لەو شەوە پڕسام و بێدەنگی ئەو ڕۆژانە، دەنگی هەزار ئاهەنگی (حەمە ساڵح دیلان)، زیندانی ئەژدەهاکی مامۆستا گۆرانی مەزنی بە نەتەوەی کورد لە کوردستانی ئێران ناساند، ناوی دیلان و گۆران کەوتە سەرزاران و شۆرەتیان ئەستاند، لە حاڵێکدا کە کەس سیمای ئەو دوو ناوداره ئازیزەی نەدیبوو..".

هەر ئەو تێڕوانینانەی (عەبدولقادر دەباغی) بۆ ئەو کاتە و بۆ ئەو قۆناغەی خەباتی گەلی کورد، بۆ خۆیان تێڕوانینی هەموو شۆڕشگێڕێك و هەموو هونەردۆستێکی کورد بووە و هەر بەو چاوەش لە ئاواز و گۆرانی ڕوانراوە کە: "لەم سەردەمی ڕاپەڕینی نەتەوایەتییەدا بە تایەبتی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، گومانی تیا نییە کە ئەبێ هونەریش شانبەشانی ئەدەب و زانست و بزووتنەوەی نیشتمانی بڕوا و لە پێشکەوتنا بێت.. ئێمە کە نەتەوەی کوردین، بە تایبەتی لەم ڕۆژە تەنگوچەڵەمەیەماندا، زیاتر لە لایەکی تر پێویستمان بە گرتنی ڕێگەی وریاکردنەوەی گەل و کۆمەڵ و خۆراکی خاوێن بە گیان و هۆش دانە، ئەبێ هونەرمەندەکانمان بۆ هەموو هەنگاو و جووڵانەوەیەکیان بە مەبەست و ڕێگەی باسکراو بڕۆن و لانەدەن".

جا دیلانیش هەر لە ڕوانگەی ئەو بۆچوون و تێڕوانینەوە بە دەنگە زوڵاڵەکەی و بە ئاوازی ڕەسەنی کوردییەوە چەپکێ شیعری خۆی و شاعیرانی تری گەیاندۆتە دڵ و دەروونی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی و لەم ڕووەشەوە دەڵێت: "ڕەنگە هەندێك نەزانن کە بۆچی سەردەمێك ڕێم دا بە چەند دۆست و برادەرێك کە هەندێ لە گۆرانییە کلاسیکی و نیشتمانییەکان تۆمار بکرێ؟!.. سەردەمێکی کورت لە ژیانمدا سەپێنرا بە سەرما کە بچمە قاوغێکی ئەوتۆوە کە لەم ڕێگایە بەولاوە (ڕێگای نووسین) و ڕێی بڵاوکردنەوەی چەند گۆرانییەك کە گیانی نەتەوە خۆشەویستێ ئەبزوێنن نەتوانم پەل بۆ هیچی تر بهاوێژم!! تۆمارکردنی هەندێ گۆرانی وەکو (ئەژدەهاك، دەروێش عەبدوڵڵا، نەورۆز، کوردستان) زیاتر مەبەستم لە هاوکاریکردن بوو لە بزووتنەوەی بۆ پێشەوەچوونی گەلی کورد وەك لەوەی مەبەستێکی ترم هەبێ".

هەر ئەم دەنگە زوڵاڵە و ئەو گۆرانییە بە سۆزانەی بوون کە بۆ خودی دیلان خۆی بونە مایەی خەمێکی گەورە و گران و بەردەوام هەوڵی دەدا باس و خواسی ئەم هونەرەی کپ و بێدەنگ بکرێ و بەسەر زاردا نەیەت، هۆی ئەم هەڵوێستەشی هەر ئەوە بووە کە خۆی ڕوونی دەکاتەوە و دەڵێ: "ئەتوانم پەنجە بکەم بە چاوی ئەو کەسەدا کە بڵێ (بە بەرامبەرێك) گۆرانییەکی تۆمار کردووە، تەنانەت ناردرنی ئەو چەن گۆرانییە سادانە بۆ ئێسگەی کوردی بەغدا بێ ئاگاداری و پرسپێکردنم بووە، من لێرەدا مەبەستم لەوە نییە کە پێم ناخۆش بێ گۆرانییەکانم بڵاوبێتەوە بەڵکو زۆر شانازی پێوە ئەکەم کە بگاتە هەموو کونجێکی کوردستانی خۆشەویست چونکی دەنگخۆشی شتێك نییە و دروستم کردبێ بەڵکو سروشت پێی بەخشیووم، بەڵام لێدانی شریتە تۆمارکراوەکان بەو هەموو کەموکوڕییەوە، بە بێ مۆسیقا، پچڕپچڕ، تێکچوو لە ئەنجامی ئەمدەس و ئەودەس و ئەم شریت بۆ ئەو شریت، ئەڵێم بێجگە لەوە لێدانی لە هەندێ چایخانە و دوکاندا لە بەیانییەوە بۆ ئێوارە، لە ئێوارەوە بۆ نیوەشەو لە تام چۆتە دەرێ، خۆم تا ئێستا چەند جار تکای تایبەتی یا ڕاسپاردەم کردۆتە سەر ئەو چەن چایخانە و داوام لێکردوون کە سنوورێك بۆ لێدانی ئەو شریتانە دانێن، بەڵام بێسوود بوو، و لەبەرئەوەی کەمەکێ لە باری کۆمەڵایەتی کوردەواریمان گەیوم کە تا تەنانەت هێندێ لە ڕۆنبیرەکانیشمان هێشتا گۆرانی -لە پاش ملە- بە (نەنگ و خەوش) دائەنێن، ناچار بووم لە ڕێی ڕۆژنامەوە ئاگادارییان بکەم کە ئەو چەند چایخانە و دوکانە سنوورێك بۆ

لێدانی ئەو شریتانە دانێن، ئەگینا ناچارم ئەکەن پەنا بەرمە بەر – یاسا– بۆ وەستاندنی، چونکە پێشینان وتوویانە هەموو شتێ بە خوێ خوێش بە مانا".

لەگەڵ ئەم بانگەوازەشیدا کە نەك هەر شەیدایانی دەنگی بەڵکو خۆشی پێی ناحۆش بوو، نە خۆی و نە هونەردۆستان نە شەیدایانی دەنگە بە سۆزەکەی نەیانتوانیوە ئەو داوایەی جێبەجێ بکەن، بۆیە ئەو پلە و ناوبانگە کۆمەڵایەتییەی کە وەك هونەرمەندێك هەیبوو هیچی لەو پلەو ناوداریە کەمتر نەبوو کە وەك شاعیر و خەباتکەرێکی سیاسی بە دەستی هێنابوو.

دیارە کردنەوەی دەرگای ئەم باسە لێرەدا بەو هۆیەوەیە کە ئەم دەنگخۆشی و شارەزاییەی دیلان لە بواری گۆرانی و ئاوازی کوردیدا لە لایەك و خواست و ئارەزووە کپکراوەکانی بۆ ئەم بەهرە و هونەرەی لە لایەکی ترەوە، کەموزۆر لە تاقیکردنەوە شیعرییەکانیشدا کاردانەوەی خۆیان هەبووە و چڕۆکردن و باڵاکردنی گەلێك لە تۆوی تاقیکردنەوە شیعرییەکانی بە دەنگە بەسۆز و چێژە ئاوازەییەکەی ئاودراون و بنیات نراون.

4.چالاکی سیاسی و ڕۆژانی خەبات و تێکۆشان

لە سەرەتای ئەم باسەماندا دەبێ سەرنج بۆ ئەو ڕاستییە ڕابکێشرێ کە بزووتنەوە و ڕاپەڕینی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بە گشتی و شاری سلێمانی بە تایبەتی لە سەرەتاکانی ئەم سەدەیەماندا، پێش شارەکانی تری کوردستان و عێراقیش کەوتووە و سلێمانی هەر لە ساڵی 1918 بەدواوە بووە لانەی شۆڕشگێڕان و خەباتکەران و قەڵایەکی سەختی بەگژداچوونەوەی چەوساندنەوەی چینایەتی و نەتەوایەتی، هەر بۆیە ئاوێتەبوونی ڕاستەوخۆی ڕۆڵەکانی ئەو شارە بە گشتی و ڕۆشنبیر و ڕووناکبیرەکانی بە تایبەتی بە بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی گەلەکەیانەوە دیاردەیەکی هێندە ئاشکرایە کە بۆ خۆی دەبێتە سیمایەك لە سیما تایبەتییەکانی.

جا (دیلان)یش وەك شاعیرێکی پەیامدار و هونەرمەندێکی ڕەسەن و ڕووناکبیرێکی کوردپەروەری ئەو بنەماڵە و خێزانە دێرینەی شار و یەکێك لە ڕۆڵە دیار و چالاکەکانی ئەو شارە، هەر زوو زەنگی کاروانی تێکۆشان و خەبات لە پێخەفی ژیانی ژێردەستی و ملکەچی هێنایە دەرەوە و لەگەڵ ئازادیخوازان و ڕزگاریخوازاندا پێخەف و نوێنی ئارامی لە لێژیدا بۆ ڕاخرا، لێرەدا نامانەوێ بە وردی بچینە ناو بواری شیکردنەوە و یەکالاکردنەوەی بیروباوەڕی سیاسی و ئایدۆلۆژی دیلان و یەکالایان بکەینەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی ئەو یەکالاکردنەوە و ئەو دەستنیشانکردنە نەبێتە ڕوانگە و ڕێبازێکی ئایدۆلۆژی تەسك و لێیەوە لە سەرجەمی تاقیکردنەوە شیعرییەکانی بڕوانرێ، چونکە ئەگەر بەو جۆرە مامەڵەی لەگەڵدا کرا ئەوا ناتوانرێ بە پێی دەقە شیعرییەکان خۆیان سەرنج و تێڕوانینی گەلاڵە بکرێت، بۆیە جارێ هەوڵی ئەوە دەدەین ئەو ڕاستییە ڕوون بکەینەوە کە ئەویش ئەوەیە، ئەم لایەنەی ژیانی (دیلان) بووە ژێرخانی هەموو چالاکییەکانی تری ژیانی و بە چەشنێ ڕەنگی بۆ ڕشت کە کەسێتی (دیلان)ی وەك شاعیر و وەك هونەرمەند و وەك مرۆڤ پێبناسێنرێ.

وەك ئاشکرایە، ساڵانی دوای جەنگی جیهانی دووەم، نەك هەر لەسەر ئاستی کوردستان و عێراق، بەڵکو لەسەر ئاستی هەموو جیهانیش، ساڵانی جۆشساندنی خەبات و بزووتنەوەی ئازادیخوازی گەلان بووە، ساڵانێك بوو کە کاروانی خەبات و تێکۆشانی گەلە ژێردەست و چەوساوەکان دڕیان بە تاریکیی داگیرکەران دابوو، پەیتاپەیتا بەرەو ڕۆژی ئازادی و سەرفرازی هەنگاویان دەنا.

جا هەر لەو ساڵانەدا (دیلان)ێکی چاوەڕێکەری زەنگی ڕاپەڕین و تێکۆشان، ڕاستەوخۆ ئاوێتەی ئەو کاروانە بووە، هەر بۆیە بە یەکێ لەوە تێکۆشەرەکانی ئەو ساڵانە بە گشتی و بە خەباتکەرێکی لە کورە دەرچووی ڕاپەڕینەکەی کانوونی 1948 دادەنرێت، خۆشی ئەو ڕاستییە دووپات دەکاتەوە و دەڵێ: "لەگەڵ هاوبەشی بزووتنەوەی نیشتمانی کوردا کەوتمە کۆڕەوە، لە ئەنجامی بەشداربوونم لە خۆپیشاندانەکانی دژی پەیمانی بروتسمۆس".

ئەوەی لێرەدا پێویست دەکات سەرنجی بۆ ڕابکێشرێ دوو ڕاستین، یەکەمیان: هۆکاری سەرەکی لە بەشداریکردنی ڕاستەوخۆی زۆربەی تێکۆشەرانی کورد لەو ڕاپەڕینەدا، جا لە بەغدای پایتەخت بووبێ یان لە شارەکانی کوردستان بووبێ، جگە لەو هۆکارانەی کە بە ڕۆڵەکانی تری گەلی عێراقییەوە دەبەستنەوە، فەرامۆشکردنی مافە نەتەوایەتییە ڕەواکانیان بووە لەو پەیمانەدا.

دووەمیشیان: ئەو ڕاستییەیە کە ڕاپەرینەکەی کانوونی دووەمی 1948 بۆ جارێکی تر خەبات و تێکۆشانی نەتەوەکانی عێراقی پێکەوە گرێ داو لە یەك سەنگەری بەرگریدا کۆیکردنەوە و لە یەك بەندیخانەشدا وانەی نەبەزین و درێژەپێدانی خەباتی هاوبەشی فێرکردن، خەباتێك کە دوای دە ساڵ و لە بەرەبەیانی 14ی گەلاوێژی 1958دا بەرەکەی پێگەیشت، ئەو بەرەی کە بە داخەوە (کورد)یان لێ بێبەش کرد، هەر بۆیە لە شوێنی خۆیدا ڕزی و کەس تامی لێ نەکرد.

هەر لێرەوە کە ئاوڕ لە ساڵانی دوورودرێژی خەبات و تێکۆشانی دیلان دەدرێتەوە، ڕووبەڕووی ئەو ژیانە دەبینەوە کە دیلان خۆی بە "ژیانی بەندیخانە" و "ژیانی زنجیراوی" ناوی دەبات.

یەکەم لاپەڕەی ئەو ژیانە زنجیراوییەش لە ساڵی 1943ەوە دەست پێدەکات، کاتێ کە قوتابی ناوەندی دەبێ و پاش سەیرانێکی قەڵاچوالان لەگەڵ دەستەیەك لە هاوڕێکانیدا دەگیرێن و دەخرێنە بەندیخانە.

لە دوای ڕاپەڕینەکەی کانوونی دووەمیشەوە دیلانی خوێنگەرمی تەمەن بیستویەك سالە بەردەوام لە گەرمەی خۆپیشاندان و ڕاپەڕینەکانی ئەو ساڵەدا وەك دواندەرێکی دلێر، دەنگە زوڵاڵەکەی جۆش و خرۆش بە جەماوەری ڕاپەڕیو دەسێنێ، بۆیە لە ڕۆژی 1948/5/5دا لە کارەکەی دەری دەکەن و لە بڕیاری دەرکردنەکەشدا هۆکەی بۆ دەنووسرێ (لاشتراکه فی المظاهرات و القائه الخطب).. وەك دەردەکەوێ بەو دەرکردنە وازی لێناهێنن بەڵکو هەر بە دواوەیە دەبن تا لە ئەنجامدا دەیگرن و دەیدەن بە ئەنجوومەنی عورفی لە کەرکوك، بەڵام ئەوەی باش دەبێ هەروەك خۆی لە لاپەڕەی یادگارەکانیدا دەڵێ: "سەرۆکی ئەنجوومەنی عورفی نیشتمانپەروەر بوو. هەموومانی تەبریە کرد.. ئێوارێی 1948/8/9 بەربووین و بە ڕەحمەت بێ حەمەی حاجی فەرەج لەگەڵ خۆیدا هێنامیەوە بۆ سلێمانی".

لە بیرەوەرییەکانی دڵزاری شاعیردا ئەم چەند دێڕە دەربارەی دیلان لەو ڕۆژانەدا و لە بەندیخانەکەی کەرکوکدا دەخوێنینەوە: "گرتووخانەکە تا چەند مانگێك پێشتر قوتابخانەی سەرەتایی بوو لەبەر زۆری گیراوان کردبوویانە گرتووخانە لەوێ جگە لە ئێمە کۆمەڵێك برادەرانی پارتیشی لێبوو کە یەکێکیان حەمە ساڵح دیلان بوو ئەوسا لە هەڕەتی لاویدا بوو، کوڕێکی باڵا ناوەنجی و گەنم ڕەنگێکی ڕووخۆش و چاوگەش و نیگاتیژ و زمان پاراو بوو، تەمەنی بیستویەك ساڵێك بوو. هەر زوو زوو دەنگی لێهەڵدەبڕی کۆپلە شیعرێکی دەچڕی کە زۆر جار لە یەك دەقیقە پتری نەدەخایاند و تێکڕای ئەو خەڵکەی هوشیار دەکردەوە گوێیان بۆ ئەو دەنگە زوڵاڵە هەڵدەخست".

ڕەنگە ئەو لێبووردن و بەربوونە بۆ هەندێ کەس بووبێتە تاقیکردنەوەیەك و ئیتر وای لێکردبێ دەس بە کڵاوی خۆیەوە بگرێ، کەچی بۆ دیلان بووە هەلێك و هێنایەوە ناو کۆڕی خەبات و بووەوە بە ئاگر خۆشکەری ڕاپەڕینەکانی جەماوەر، ئەوە بوو لە ڕۆژە سەختەکەی زستانی ئەو ساڵەدا کە ڕۆژی 1948/12/18 بوو لە کاتێکدا جەماوەری شاری سلێمانی تەرمەکەی شاعیری نیشتمانپەروەری کورد (بێکەس) دەخەنە سەرشانیان و بەرەو گردی سەیوانی دەبەن تا لەژێر دار ئەرخەوانە ڕووتەکاندا بە خاکی بسپێرن، دووبارە دەنگە دلێرەکەی دیلان تێکەڵاوی نەڕەی شێرانەی (کامەران) دەبێت و سەهۆڵبەندانی سرووشت و دەروونی جەماوەر دەشکێنن و سەرلەنوێ خوێنی دەمارەکانیان دەبزووێننەوە، بەمەش پیاوانی ڕژێمی پاشایەتی شێتگیر دەبن و پاش ئەوەی ناتوانن بە دامەزراندنیان لە خشتەیان بەرن هەردووکیان دەگرن و دەیاندەن بە ئەنجوومەنی عورفی لە بەغدا.

ئەگەرچی لەم جارەشیاندا دووبارە خەریك دەبێ هەلێکی تری بۆ بڕەخسێ و بە کەفالەتی (200) دینار بەربدرێ، بەڵام بە هۆی دانپیانانی (ڕەفیق چالاك)ەوە گل دەدرێتەوە و هەشت مانگێك لە ژوورە تاریکەکانی بەندیخانەی ئەبوغرێبدا دەیهێڵنەوە ئینجا بە ساڵێك بەندی و بە ساڵێك چاودێری حوکمی دەدەن، پاش ئەوەی ماوەیەك لە بەندیخانەی ناوەندی بەغدا ئازار دەدرێ، دەیگوێزنەوە بۆ بەندیخانەی کوت، ئەم گواستنەوەیەشی پێخۆش بووە، چونکە توانیویەتی پشوویەك بدات لەبەرئەوەی ئێرە بێدەنگ بووە و تێهەڵدانی تیادا نەبووە، لە دوای ئەوەی کە ماوەی ساڵە بەندییەکەی تەواو دەکات چاودێریکردنەوەکەی لە سلێمانی بۆ دادەنێن، بەڵام ئەوەندە ناخایەنێ کە دەیگرنەوە و ڕەوانەی شاری عەمارەی دەکەن تا لەوێ لەژێر چاودێریدا بمێنێتەوە.

لەو ساڵانەدا کە دیلان بووە ئاشنای بەندیخانەکانی ڕژێمی پاشایەتی بزووتنەوەی ئاشتیخوازی سەرتاپای عێراقی گرتبۆوە بە جۆرێ پەرەی سەندبوو کە بووە شیرازەیەکی بەهێز و خەباتکەران و تێکۆشەرانی پێکەوە دەبەستەوە و بەرەو ڕاپەڕینو خۆپیشاندانەکان ڕای دەکێشان، بۆیە دیلانیش کە هەر زوو ڕۆڵی کاریگەری ئەو بزووتنەوەیەی دەرك پێکردبوو، پاش تەواوکردنی ماوەی دەستبەسەرییەکەی لە ساڵی 1951 لەگەڵ دەستەیەك تێکۆشەری تری هاوڕێیدا بنکەی ئەو بزووتنەوە ئاشتیخوازییەیان لە سلێمانی دامەزراند و چالاکانەش کاریان تیادا کرد، لەگەڵ ئەوەی بزوتنەوەی ئاشتیخوازی لە عێراقدا بە گشتی و لە کوردستاندا بە تایبەتی بزووتنەوەیەکی شێوە بەرەیی بووە و هەموو پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکانی ئەوکاتەی کۆکردۆتەوە و لە چوارچێوەیدا کێشە نیشتمانییەکان و کێشە جیهانییەکان یەکالا کراونەتەوە، بەڵام لە ئاکامی چالاکی دیار و بەربڵاوی کۆمۆنیستەکان تیایدا، بزووتنەوەکە سیمایەکی سیاسی وەرگرت و بووە بزوێنەری ڕاپەڕینە یەك لە دوای یەکەکانی جەماوەر دژی ڕژێمی پاشایەتی، هەر لێرەوە و لە کاتێکدا تێڕوانینی کۆمەڵێ تێکۆشەری سەر بە پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکانی ئەو قۆناغە ئەوە بووە کە ئاشتی بە ڕزگارکردنی گەلانی چەوساوە و ژێردەست دێتە دی، دیلانی شاعیر لە ڕوانگەی ئەو بۆچون و تێڕوانینەوە کە ئاشتی بۆ خۆی باشترین هەل و فرسەت دەخاتە بەردەم بزووتنەوەی ڕزگاریخوازییەوە، چووە ناو ڕیزەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراقەوە و ماوەیەك بەو بیروباوەڕەیەوە درێژەی بە خەبات و تێکۆشاندا.

هەر لەو ساڵانەدا و لە گەرمەی چالاکی ڕۆژانەی ناو بزووتنەوەی ئاشتیخوازییەکەدا، دیلانی شاعیر ئەو هەلەی بۆ دەڕەخسێ کە دنیای دەرەوە ببینێ و لە نزیکەوە تێکەڵاوی ئەو گەل و نەتەوانە بێت کە دوای جەنگی جیهانی دووەم و ئازادیی و سەربەخۆییان بەدەست هێنابوو، ئەمە جگە لە ناسینی کۆمەڵێ لە کەسایەتییە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمە، ئەم هەلەش کاتێ بوو کە لەگەڵ وەفدێك نێررا بۆ بەشداریکردن لە (کۆنگرەی گەلان بۆ بەرگریکردن لە ئاشتی) کە لە ڤێننا لە 12ی کانوونی یەکەمی

1952دا بەستراوە و هەروەك خۆشی دەڵێ: "لە 1952دا نێردرام بۆ هاوبەشی لە (مؤتمر شعوب للدفاع عن السلام) کە لە ڤێننا گیرا. لە ڤێننا زۆر کەسم دی، زۆر کەسم ناسی یەکێ لەوان (ئیلیا ئەهرنبورغ)ی کاتبی گەورەی سۆڤێتی بوو".

پاش گەڕانەوەی دیلان لە ڤێننا سەرلەنوێ بڕیاری گرتنی دەردەچێت، ناچار بۆ ماوەی ساڵێك خۆی دەشارێتەوە بێئەوەی دەست لە چالاکی ڕۆژانەی خەباتکردن هەڵبگرێت[11]. لە ساڵی 1953دا کاتێ بۆ ماوەیەك حوکمی عورفی هەڵدەگیرێ، ئەمیش خۆی ئاشکرا دەکات، بەڵام هێندە ناخایەنێ دەیگرن و دەیدەن بە دادگای جەزای بەغدا، لەم کاتەدا هاوڕێکانی لە بزووتنەوەی ئاشتیخوازیدا توانایان دەخەنە کار بۆ ڕزگارکردنی و هەروەك خۆی باسی دەکات (شەست و دوو پارێزەر خۆیان تەبەڕوع دەکەن بۆ دیفاعکردن لێی لە پێش هەمووشیانەوە (حسێن جەمیل)، لە ئەنجامدا و دوای ئەوەی دادگاییکردنەکەی دوو سێ مانگ دەخایەنێ بەردەدرێت و دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی.

ژیانی ڕۆژانەی دیلان لە دەرەوەی بەندیخانەکان هێندە ناخایەنێ و لە هاوینی 1954دا کاربەدەستانی ڕژێم بڕیاری گرتنی دەدەنەوە، ئەگەرچی ئەویش بۆ ماوەی شەش مانگێك دەتوانێ خۆی لە پیاوانی ڕژێم بشارێتەوە، بەڵام فرسەتی لێدێنن و شەوێك دەیگرن و دەیدەن بە دادگای جەزای سلێمانی و دواییش بە دادگای ئیستئنافی کەرکوك، لە ئەنجامدا و لە کانوونی دووەمی 1955 بۆ ماوەی ساڵ و نیوێك بە دەستبەسەری ڕەوانەی نوگرەسەلمانی دەکەن، پاش تەواوکردنی ئەو ماوە دوورودرێژە لە ناوەڕاستی 1956دا دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی هێشتا بە تەواوی بە بینینی شار و بە دیدەنی تێکۆشەرانی دەرەوەی بەندیخانەکان چاوودڵی ڕۆشن نابێتەوە کە هێرشە سێ قۆڵییەکەی سەر میسر دەست پێدەکات و جارێکی تر هەستی برایەتی و هاوخەباتی جەماوەری سلێمانی دەبزوێنن و ڕووبەڕووی دامودەزگاکانی ڕژێمی پاشایەتییان دەکاتەوە، دیارە دیلانیش کە لە ڕیزی پێشەوەیاندا بووە، دەکەوێتە بەر هێرش و پەلاماری کاربەدەستان و پاش گرتنی دەیدەن بە ئەنجوومەنی عورفی و بە دوو ساڵ چاودێریکردن لە سلێمانی حوکمی دەدەن.

لەو ماوەیەدا کە لە سلێمانی دەستبەسەر دەبێ، (عبدالمطلب امین الهاشمی) دەکرێ بە موتەسەریفی سلێمانی و (ئەورەحمان موفتی)یش دەبێ بە یاریدەدەری، هەروەك لە پێشدا باسمان کرد، دیلان ڕازی دەکەن و لە سەرەتای ساڵی 1958دا دەیگەڕێننەوە سەر کاری فەرمانبەرێتییەکەی، دیارە ئەم ڕەزامەندییەی دیلان و گەڕانەوەی بۆ ژیانی فەرمانبەرێتی، پەیوەندی بەو دۆخە تایبەتییەی ژیانییەوە بووە کە وەك خۆی دەڵێ نەیتوانی پەل بۆ چالاکی سیاسی بهاوێژێ، ئەو سەردەمەش بۆ خۆی هەر هەمان سەردەم بوو کە خاڵی وەرچەرخانی سیاسی دیلانی تیادا بەدی دەکرێ و تیایدا لە پارتی کۆمۆنیست دادەبڕێ و ڕاستەوخۆ ڕوو لە بیروباوەڕی ناسیۆنالیزمی دەکات، هەرچۆنێ بێ ئەو ماوەیەی کە دیلان لە چالاکی سیاسی دووردەکەوێتەوە، هێندە ناخایەنێ بە هەڵهاتنی ڕۆژە گەشەکەی 14ی گەلاوێژی 1958 کۆتایی پێدێت.

ئاشکرایە کە شۆڕشی 14ی گەلاوێژ، نەك هەر گەلانی عێراقی گەیاندە لووتکەی سەرکەوتن، بەڵکو وا دەبینراو وا چاوەڕوان دەکرا لێی کە ڕۆژێکە ئاوابوونی بۆ نییە، بۆیە لەو ڕۆژەدا یەکێکی وەك دیلان، لە دوو لاوە شاگەشکە بووبوو، لە لایەك وەك کوردێك دەمێك بوو چاوەڕێی ئەو ڕۆژەی دەکرد و گوێی بۆ بەستەی سەرکەوتنەکەی هەڵخستبوو، لە لایەکی ترەوە وەك هاوڕێیەکی دڵسۆزی هەموو تێکۆشەرانی گەلی عێراق شادمان بوو بە دیاردەی یەکگرتنە نوێکەیان و بڕوا بە یەکبوونەکەیان، بۆیە کە گۆرانی ئەو سەرکەوتنەی دەچڕی دەیوت:

بڵێ لە جێی چەرمەسەری و بێزاری
شادمانی و کامەرانی بە بارە
بڵێ لە جێی بێبڕوایی و ناکۆکی
کاروانەکەی (یەکگرتنە) قەتارە

سەرەتا و سەرباری هەموو ئەو تیشکە ڕووناکانەی کە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ پەخشی دەکرد و ژیانی کۆمەڵانی خەڵکی ڕۆشن دەکردەوە و ئومێدێکی گەورەی بە دواڕۆژ لە دڵیاندا دەڕواند، بۆ کەسی دیلان بووە هۆی ئەوەی ماوەیەك تراژیدیای (ژیانە زنجیراوی)یەکەی دادرێتەوە، بۆیە دەڵێ: (1958، 1959 ماوەی پشووی بێ حەپسخانە ڕابواردن بوو..)' هەر لەم ماوەیەشدایە کە لەگەڵ دەستەیەك لە ئافرەتان و لاوانی دیموکراتی کوردستان تێکەڵاوی وەفدێکی عێراقی دەکرێن و لە 1959/7/20دا دەنێردرێن بۆ میهرەجانی لاوان لە ڤێننا.

ئەم گەشتەی دیلان لەو کات و ساتەدا و لە گەرمەی ئەو خوێنجمانەی کوڕوکاڵانی کوردا کە تاکە هیوایان ئەوە بوو لە سایەی شۆڕش و کۆمارەکەی چواردەی گەلاوێژدا مافە نەتەوایەتییە ڕەواکانیان دابین بکرێ، تاقیکردنەوەیەکی هێندە بەپێز بوو کە بە هەردوو دیوی گەشبینی و ڕەشبینییەوە کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر ژیانی دیلان و تاقیکردنەوە شیعرییەکانی هەبووە.

ئەوە بوو کە جارێ هێشتا وەفدەکە بە ڕێگاوە بوون کە لە لایەن سەرۆکی وەفدەکەوە ئامۆژگاری دەکرێن بە وەی کەسیان نابێ بڵێن کوردین، بەڵکو بە ناوی عێراقییەوە خۆیان بناسێنن، لەگەڵ ئەم ئامۆژگارییەی خۆشیاندا، کە دوایی دەرکەوتووە مەبەست لێی هەر وەفدەکەی کورد بووە نەك خۆیان، ڕازی نەبوون و نەیانهێشتووە وەفدەکەی لاوانی کورد نە ئاڵاکەی عێراق و نە

دروشمی کۆمارەکەیان هەڵبگرن، ئەو ئالاّیەی کە بە تێکۆشان و خەباتی ئەمانیش بەرزکرایەوە و ئەو درووشمەش کە خەنجەرەکەی کوردی تیادا نەخشە کێشرابوو، ئەم هەموو ڕەفتارانەی کە جاری وا دەبێ دوژمن لەگەڵ دوژمنی ناکات نەك برا بە برا، وەفدەکەی کوردی ناچار کردووە تا بەهەر شێوەیەك بێت دەنگی خۆیان بگەیەننە ئەو لاوانەی کە لەوێ بە سەربەستی ئالاّی ولاّتەکانیان دەشەکانەوە.. هەر بۆیە دیلانێکی ئازارچەشتووی بەندیخانەکان تاوێ فرمێسك بە چاویدا دێتە خوارێ کە ئالاّی نەتەوەکەی خۆی نابینێ و تاوێکیش بە سروودی (ئەی ڕەقیب) دەنگی نەبەزیوی کورد بە گوێی ئامادەبووانیدا دەدا".

هەرچۆنێ بێ ئەو تاقیکردنەوە تاڵە و سەدانی لەوەش دژوارتر لەو ساڵانەدا بۆ (دیلان)ێکی ڕاستگۆی خەباتکەر و تێکۆشەر، بۆ (دیلان)ێك کە هەر لە زووەوە بووبووە دۆستی گەلە چەوساوەکانی جیهان و بەردەوام لە خەمی (برایەتی و یەکێتی)یەکەدا بووە، چەند بووبێتە مایەی ئەوەی توندتر بە کێشەی ڕەوای نەتەوەکەیەوە و بە هیوا و ئاواتی گەلی کوردییەوە ببەستێتەوە، هێندەش لە ڕوانگەی پێشکەوتنخوازییەکەیەوە هەر خەمخۆرێکی دڵسۆزی برایەتی و هاوخەباتییەکە بووە، ئەم هەڵوێستەشی بە ئاشکرا لەو وتارەیدا دەبینرێ کە بە ناونیشانی (ئەوەی ئامانجمانە) و تیادا دەڵێ: "لە پێش هەموو شتێکدا چ بۆ گەیشتنە ئامانجە نزیکەکان و چ بۆ ئامانجە دوورەکان پیرۆزترین و تەوژمترین پێویست جێگیرکردنی برایەتییە لە میانی هەردوو نەتەوەکەدا".

دوابەدوای گەڕانەوەی دیلان لە ڤیننا، هێندە نابات ماوەی (پشووی بێ حەبسخانە)کەشی کۆتایی پێدێت و هەر لەو ساڵەدا واتە ساڵی 1959 لەسەر بزووتنەوەی لاوانی دیموکراتی کوردستان دەگیرێ و ڕاپێچی بەندیخانەی دەکەنەوە، لەگەڵ ئەوەی گرتنی ئەمجارەی لە چەند ڕۆژێك زیاتر ناخایەنێ، بەلاّم گومانی تێدا نییە کە لە دوو لاوە کاردانەوەی لەسەر هەست و بیروباوەڕ و تێڕوانینەکانی دیلان هەبووە، لە لایەك بووەتە مایەی خەمێکی نوێ و چاوەڕێ نەکراو، بەوپێیەی هەرگیز ئەوەی بە بیردا نەدەهات کە پاش هەڵتەکاندنی بەندیخانەکانی ڕژێمی پاشایەتی، بەندیخانەی کۆماری میوانداری تێکۆشەرێکی وەك ئەم و هاوبیرەکانی ئەو قۆناغەی بکات، لە لایەکی ترەوە کورد واتەنی (مانگەشەو سەر لە ئێوارە دیارە)، کە دەیبینی وا خەریکە خەنجەری ناو درووشمە کۆمارییەکە کاڵ دەکەنەوە و لە دەستیشیان بێت دەری دەهێنن، ئەوەندەی تر ڕقئەستوورتر دەبوو، هەر بۆیە دووبارە پەردەی (ژیانە زنجیراوییەکەی) هەڵدرایەوە و بەشێکی تر لە تراژیدیای (دیلان و بەندیخانەکان) دەستی پێکردەوە، لە ماوەی نێوان تەمووزی 1960 و ئەیلولی 1961 دا دوو سێ جار دەگیرێ و دەدرێ بەئەنجوومەنی عورفی بەغدا، تا لەو کێشمەکێشەی گرتن و بەردانە ڕزگاری دەبێ و دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی، بڵێسەی (شۆڕشی ئەیلوول) کڵپەی سەندو شەڕی بەرگری لە دەربەندی بازیان و دەربەندیخان بەرپا بووبوو، جا هەر لەو ساڵەدا سەرلەنوێ دەیگرنەوە و ڕەوانەی بەندیخانەی (کوت)ی دەکەن، دوای شکاندنی بەندیخانەی (کوت) و دەربازبوونی هەندێ لە بەندییەکان ئەمیش ڕەوانەی سلێمانی دەکرێتەوە و لەوێ بەری دەدەن.

لە مانگی کانوونی دووەمی 1963ەوە تا شوباتی 1964 لە بەندیخانەکانی سلێمانی و کەرکووك و بەغدا و مانگێکی ساڵی 1966یش لە بەندیخانەی کەرکووك وەك دیارییەکی شۆڕشگێڕانە بەشێك لە تەمەنی بەجێ دەهێڵێ".

لە کۆتایی ئەم تراژیدیایەی ژیانی دیلاندا، با سەرەتا گوێ لە خۆی بگرین و بزانین خۆی چی دەڵێ و چۆنی هەڵدەسەنگێنێ:

"ئایا ئەم تەمەنە ناونانرێ ژیانی بەندیخانە، ناونانرێ ژیانی زنجیراوی.. ناونانرێ.. ئەمەیە ژیان.. ئەمەیە گوزەران.. ئەمەیە خۆش ڕابواردن.. بەڵێ زۆربەی ژیانم بریتی بوو لە زیندان لە پێناوی نەتەوەکەمدا.. لە پێناوی کوردا.. لە پێناو هەژار و بەشخوراو و چەوسێنراوی نەتەوەکەم، لەبەرئەو بمرم ڕووم سوورە.. ڕووم گەشەدارە.. یەکێکم لە زینداندا ڕزیو و نەخۆشکەوتوو و دەردەدار لە پێناوی زۆربەی گەلەکەمدا".

ئەو شەقڵە دلێرییە و ئەو سیمای شانازییەی کە لەم دەنگەی دیلاندا ڕاستەوخۆ هەستی پێدەکرێ، لە ناخدا سۆزی خەمێکی شکۆمەندانەی لێ دەتکێ و بە چرپە ئەوە دەدات بە گوێدا کە دەبوو هەر زوو دیلانی مرۆڤ و شاعیر و هونەرمەندی دەنگخۆش بەو پێناسەیەش کە لە بەندیخانەکاندا وەریگرتبوو، پێناسەیەك کە لە لای کەم کەس هەبووە، بە کوڕوکاڵانی گەلەکەمان بناسێنرایە، چونکە هەر ئەم ڕێڕەو و ڕێبازەی ژیانی بووە کە هەموو چالاکییەکانی تری ژیانی خستبووە ژێرباڵی خۆیەوە و هێزوتینی پێ بەخشیوون، بە تایبەتیش تاقیکردنەوە شیعرییەکەی و گۆرانییە بەسۆزەکانی.

هەرچی تێڕوانینی ئێمەشە لێرەدا، کە بۆ خۆی گەلاڵەبووی هەموو ئەو ڕاستیانەن، لە ڕاستییەکی تردا کۆی دەکەینەوە و بە دڵنیاییەوە دەڵێین: ئەوەی ڕۆژێ دیلانی تووڕە و هەست ناسك، ڕوو گرژ و ڕووخۆش، گەشبین و ڕەشبین، چاو فرمێسکاوی و لێوبەخەندە، دەس لەسەر دڵ بۆ نەتەوەکەی، سەربەرز و نەبەزیوی دیبێت، بۆی دەردەکەوێت کە نموونەی کوردێکی ڕەسەنی سەردەمەکەی بووە، کوردێك کە بە دەسرازەی خەمە مێژووییەکەی کوردەوە بەسراوەتەوە و گۆشکراوە و هەر بەو خەمەشەوە سەری نایەوە:

"نەتەوەکەم کۆنە.. خاوەنی زەوی، خاوەن زمانە، خاوەن تەعبیرە، خاوەن هەستان و جۆشوخرۆشە لە ئەنجامدا هەر ئەگاتێ.. هەر ئەبێ بە خاوەن قەوارەی نەتەوایەتی خۆی.. ئاخ ئەو رۆژەم بدیایە.. ئاخ ئالای کوردم بەربایە.. نەك بۆ رۆژێ.. مانگێ.. ساڵێ، بەڵکو وەکو گەلانی جیهان. ئەوسا ئەموت:

نەمردم. دیم شنەی دێ، وا شەکەی دێ شایەنی رێزە

ئەوەی پێت ئاشنایە.. پێت بەهایە پێت نەوایە ئاگرە و نێزە.

هەر ئەو خەمە مێژووییەی کە بە ژیانییەوە ئالابوو، رۆژانە بە جوانـاوی تەمـەنی ئـاو دەدرا، بۆیـە لـە نامەیـەکی رۆژی 1962/3/22یدا بـۆ (دکتـۆر مـارف خەزنـەدار) دەڵێـت: "هـەرچی چۆنـێ هـۆی دواخسـتنی وەڵام لـەلای منـەوە، ئاشـکرایە کـە کەموکوڕیم نواندووە، بەڵام هۆی هەرە گەورەی کەمتەرخەمیم لە وەڵامدا.. بریتی بوو لە شـێواوی دەروونیم.. ئێستێ لـە جاران باشترم.. مەبەستم لەوەیـە. خـەریکم بـەرەو ئۆقـرەی بیرکردنـەوە ئـەڕۆم.. ئەگـەر کارەسـات وا بـە خـێرایی نـەڕوات.. کـە ئـەڵێم کارەسـات.. هەمیسـان مەبەسـتم لەوەیـە کـە نـاتوانم لـە هـەموو سووچێکەوە بۆت بنووسم و ناشتوانم سەرە قەڵەمیشت بدەمێ.. چونکێ کارەساتەکان ئەوەندە زۆر و تێکترشاو و بەگوڕ ئـەڕۆن.. چاومێشـکی ئـەوێ لێکیـان هـەڵپچڕێ و بیـان خوێنێتـەوە و هەریەکـە بەرامبـەری بۆ دانێـت). پـاش تێپـەڕبوونی دە سـاڵێك بەسەر ئەو نامەیەیدا، هەمان بێئۆقرەیی و دەروون شێواوییەکەی لـە نامەیـەکی تریـدا، ڕەنـگ دەداتـەوە. ئـەوەتا لـە رۆژی 1972/11/25دا دیسـان بـۆ (دکتـۆر مـارف خەنـەدار) دەنووسـێ و دەڵـێ: "مـن ناتوانم بڵێم باشم، بەڵام ئەگـەر بڵـێم خـراپ نیـم درۆ ناکـەم، چوکـە نـە باشـم نـە خراپـم.. کـە ئەمـەش بـە واتـەی بـیر قووڵەکان (هیچ ئەگەیەنێ).

هەر ئەو خەم و پەژارە و بێئۆقرەییەشی بووە کە بوونەتە ژانی لەدایکبوونی شیعری ڕەسەن لە لای و چاویان بە دەیان بەرهەمی شیعریی هەڵهێناوە.







* ئەم باسە بەشێکە لە نامەی دکتۆراکەی بەڕێز دکتۆر دلشاد عەلی مامۆستا لە بەشی کوردی کۆلیژی زمانی زانکۆی سلێمانی، کە تایبەتە بە دیلانی شاعیر.

**نمونەیەك لە شیعرەكانی**

# كاروان

**1954**

**كەوتۆتە ڕێ كاروانی ئەم كوردە بە جارێ**
**دەنگی زەنگی هەناوی (زۆر) دێنێتە خوارێ[1]**
**ڕی ئەبرێ با هەوراز و پڕ دڕك و داڵ بێ**
**تەكان ئەدات بەرەو هیوای گەیین بە شارێ[2]**
**بەرەو جێیە ئینسانەكان دەستی ماندوویان**
**بخەنە سەر سكی تێری بە كسب و كارێ**
**ڕۆژی ئامانج چریسكەی بێ و هاژەی شەتاوان**
**خەرمانی گوڵ بە شەفاف بێ و خونچەی كەنارێ[3]**
**بی شەكێنێ شنەی شەماڵ بای كامەرانی**
**ڕووناكی دڵ چرایە بۆ شەوی تارێ[4]**
**كەوتۆتە ڕێ كاروانەكەی پڕ چەك بە بڕوا**
**نای وەستێنێ گەڤینی سەگ گەزینی هارێ[5]**
**بەناو دەرە و چیای سەختا بە چنگەكڕێ**
**سەرئەكەوێ بۆ ئەوپەڕی دەشت و بەهارێ[6]**
**بەڵام كاروان لەگەڵ ئەوەی پشتی ئەستوورە**
**بە لاوچاكی دەور و پشتی لەش زرێدارێ**
**تاكە تاكە لە ڕێچكەیدا سەر نەوی كرد و**
**سنگ ئەكوتێ ورد لەسەرخۆ وەك زەردە مارێ[7]**
**بەو نیازەی سا كەی هەلێ، یەكێ پێی ڕێكەوت**
**لە شەقامی ڕۆیین دەرچێ گورج پەلامارێ**
**دانی تیژی زەهر ئالووی تێ بچەقێنێ**
**بۆ ئاژاوە و سەرلێشێوان (بێتە دارێ)[8]**
**ئەبێ پێشەنگ ئاگادار بێ و ورد بۆی بنواڕێ**
**زەردەخەنەی ژەهراویان بخاتە بارێ[9]**
**هیچ نەهێڵێ برۆ جووت كەن كلك ڕاوەشێنن**
**بە چەكوشی ئاسنینی سەریان بهاڕێ[10]**
**بە پەڕۆیی كلكی پیسیان بگرێ بەڵا چۆن؟**
**وای فڕێدا بێتە پەندی ڕووی ڕۆژگارێ**

1–**زۆر: زۆرداری ستەم زوڵم.**

2–**تەكان: گوژم خۆڕاتەكاندن بۆ پێشەوە.**

3–**خەرمان: خۆ كردنەوەی گەشانەوەی پشكوتنی.**

**بە شەفاف بێ: بە شەوق بێ، بە كەیف بێ.**

**واتەكانی گوڵ ئەكرێتەوە و ئەگەشێتەوە، ڕووی خۆش پڕ لە كەیف و شادی بێ،**

(–) **كە نارێ: قەراغێ، لێوارێ، كەناری چەم، گویێ چەم.**

4–**بیشەكێنێ: بیلەرێنێتەوە، بیجولێنێتەوە.**

5–**گەڤین: وەڕینی سەگ هەڕەشە و گوڕەشەی سەگ دیارە كە سەگ ئەوەڕی بەو وەڕینە هەڕەشە ئەكات.**

(–)**هار: سەگ كە هار ئەبێ لە خۆیەوە پەلامار ئەدا و گەزینی سەگی هار مەترسی هەیە وەك ئەڵێن: لیكەكەی میكرۆبی نەخۆشی لەگەڵدایە.. بۆیە هەوڵی نەهێشتنی سەگی هار ئەدرێ.. و پەندێكیش لەناو كوردەواریدا هەیە و ئەڵێ: سەگی هار چل شەوی عومرە!**

6–**دەرە: دەرە بەو دۆڵەی نێوان دوو گرد یان چیا ئەوترێ كە لەژێردا بەرەو هەوراز هەڵكشێت.**

7–**زەردەمار: ژەهری زەردە مار كوشندە و ترسناكە. و بە نموونەی پێوەدەرێكی ترسناك ئەهێنرێتەوە.**

8–**زەهری ئالووی: ژەهراوی پێوەدانێكی كوژەر.**

–**ببێتە دارێ: ببێتە سایە، ببێتە سێبەر لە بەریا بحەوێتەوە.**

9–**پێشەنگ: ڕابەر سەر قافڵە، پێشەنگی كاروان، گەورە، سەركردە.**

**زەردەخەنەی زەهراویان: پێكەنینی درۆ و ساختە.**

10–**لە دیوانە چاپكراوەكەی 1969دا ئەم دێڕە بەم جۆرە نووسراوە.**

**هیچ نەهێڵێ برۆ جووت كە سەر ڕاوەشێنن**

**بەڵام لە دەستنووسێكی شاعیرا بەم جۆرە نووسراوە:**

**هیچ نەهیڵی برۆ جووت كەن كلك ڕاوەشێنن**



**پێنج خشتەکی لەسەر شیعرێکی**

سالم

نەکەی هەرگیز نەمامی گوڵ ببێتە سێبەر و سایەت
بە نینۆك گەر بژاری کەی بە پووڵێ بەرهەم و مایەت
ئەوی بۆنی وەفاو عەهدە بە هیچ جۆرێ لە گوڵ نایەت
هەتا ماوم ئەچێنم تۆوی هەر خارێ لە دڵ شایەت
کە بێی بۆ سەر مەزارم دامەنت بگرن ئەگەر مردم

لە ساڵی 1958 لە ئیدارە محەلی سولەیمانی دیلان و چەند برادەرێکی لە دنیای شیعری "سالم" ئەدوێن و ئەویش ئەم شیعرەی سالمی زۆر لا جوان و ناسك ئەبێت و ئەم پێنج خشتەکییەی لێ دێنێتە کایەوە.

*

**"پێنج خشتەکی لەسەر شیعرێکی"**

سالم

من برۆی پەیوەستی ئەو نازدار شیر و تیرمە
پرچی لوول و زوڵفی ئاڵۆز کۆتەو و زنجیرمە
قوژبنی مەیخانە دایم گۆشەیی تەدبیرمە
سوجدەبردن بۆ نیگایە کردەوە و تەفکیرمە
کەی بە صەیحەی من ئەگا جەزبەی مریدی خانەقا
شەیخ ئەو پیر و موسینە من جوانێ پیرمە

دیلان وەك شاعیرێکی هەست ناسك. هۆگری هونەری بە ورزە و ئەو جۆرە ئەدەبەش کاری تێ ئەکات..
ساڵی 1958 لەگەڵ چەند برادەرێك لە ئیدارە محەلی شاری سولەیمانی ئەبێت و یەکێ لە ئامادەبووان ئەو شیعرەی سالم ئەخوێنێتەوە لە هەمان کاتیشدا دیلان ئەم شەش خشتەکییەی لێ پێك ئەهێنێ.

*

## سکاڵاییکی کورت

منم بە دەستی چەرخەوە وا گێژ ئەخۆم و ئەڕۆم
منم کە بوومە خوێنەخۆر و خوێنی خۆم ئەخۆم
من لە بەحری خەیالاتی بێوچانی ماتەما
هەر پەل ئەگێڕم نە کەلك و نە سوود و علاجە بۆم
زامدارە بولبول و لە دەوری گوڵ ئەکا ڕەقس و سەما[1]
بە کەیلی ئەشکی سوور سوور و ئەسەف و دەست و چاو ئەشۆم.

دیلان کە ئەم شیعرە دائەنێ. شەوێك لە شەوانی ساڵی 1948 لە ماڵی برادەرێکی ئەم چەند شیعرە بۆ بێکەس ئەخوێنێتەوە و بێکەس ئەڵێ: ئەمە شیعری کێیە؟. دیلان لە وەڵامدا ئەڵی هی منە!!.. ئەڵێ چی چی؟..
بڕوا بە دەستەڵاتی شیعری دیلان ناکات.. بۆیە پێی ئەڵێ: ئەمە شیعری خۆمە.. کەیفی خۆتە من ئەڵێم "هی منە"

1–ئەم دوو بەیتەی دوایی لە دەستخەتێکی "دیلان"دا بەم جۆرەش نووسراوە:
دیلانە بولبول و لە دەوری گوڵ ئەکا ڕەقس و سەما
بە کەیلی ئەشکی سروشك و ئەسەە دەست و چاو ئەشۆم

## تاوان

1967

تاوان مەردی و تاوان باری ئاسانە
زۆر کردنی.. مایەی پایەی گرانە..!
کام سەربەرزو کام مل ڕاست و بڵندە
بە یەك "مشتو" نەوی کردنی بەندە..!
چەند دەس پاك بێ، چەندەی تر دڵ خاوێن بێ
پارە ناکا.. ئەبێ دەستە و داوێن بێ
بۆ ئەو کەسەی لە پشتەوە ئەت پێکێ
لە چاوی "ئەو" ئەبێ تێکەی پێکێ[1]
بە ڕۆیینی بۆ پاشەوەی سوێند خۆر بێ
چەپڵە کوتی ساختە کەری سەد جۆر بێ
ئەبێ بە دز بە خواوەندی فێڵبازی
بڵێی گەورەم.. هۆی سەر بەرزی و شانازی
کام جێ بۆگەن کامی هێگجار ناخۆشە
ئەبێ بڵێی "بەە بەە" لەم بۆنە خۆشە
ئەبێ بە ڕۆژ کە چەن ڕووناك و پاکە
بڵێی شەوە زۆر تاریك و سامناکە
تاوان، بەرزی و تاوان باری نرخدارە
مایە یەك و دەستکەوتنی هەزارە..!
ئەی نازەنین، ئەی دوور لە دووی ئەم شارە
ساڵ لەگەڵ ساڵ هەر خۆزگا بە پێراوە
بۆ ڕابردوو، لە کاتێکا بەهار بوو
جێی زەماوەن کارێزی بەر بنار بوو[2]
نازدارەکان جەستە بە وێنەی هەردە
ڕازاوە بوو وەك گوڵی ئەو لای بەردە
بۆ نازداری و ڕوخساری شەنگی ئەوان
سووراوی کاڵ ئەڕژایە دەم ئەرخەوان
هەنگ ئەفری بۆ هێنانی هەڵاڵە
بۆ هەنگوینی سەر لێوی وەك گوڵاڵە



دەنگی بلوێر سۆزی بەستەی دڵداری
خەم ڕەوێن بوو بۆ شەوگاری بێداری
زێڕی نێرگس بە خەروار هەڵڕژابوو
چەپکی بۆ سەر، تەلی لە سنگ درابوو(3)
لووتکەی بەرزی مەشخەڵی گڕ لە مستا
چراخان بوو بۆ ئاهەنگی ئاوێستا(4)
ئاسمانی شەو پڕ چریکەی یەزدانی
خوا کردە بوو نەورۆزی نیشتمانی
ئەی نازەنین، ئەم وڵاتە شیرینە
ئەم شاخانە ئەم دیمەنە ڕەنگینە
جاری جاران مەڵبەنی جوامێری بوو
پڕ لە فرکە و پڕ بازرەقەی شێری بوو(5)
کەچی ئێستا هەموو شتێ گۆڕاوە
ڕەش و سپی لە جێیەك دانراوە
گوڵ بۆ ئاگر خونچە بۆ ناو توون خانە
دڕك و داڵ هێنراوەتە ئینجانە(6)
هێجگار سەیرە "خۆم" سەیرتر شێواوە
لەش بۆ نەهەنگ، کەشتی بۆ ناو گەرداوە(7)
ئەی نازەنین.. هەردوو بەرگ خوێناوین
هەردوو بە کوڵ بۆ ئەم کوردە گریاوین
گریانێکی لە داخانا نەك ترسان
لە بێگانە، بۆ دوژمنی لە خۆمان!
بۆ ئازاری جەرگ بڕ و بۆ ئێشێ
دار پوازی لە خۆی نەبێ ناقڵیشێ.!
بۆ.. وەکو "کەو" لە سای دەوەن بە خوێندن
هاو تیرەمان ڕابکێشین بۆ مردن!
ئای کە نەنگە ئای کە ئابڕ و تکانە
کە گەورەیە ئەنجامی ئەم تاوانە

1–لە پشتەوە ئەت پێکێ: لە پشتەوە نیشانە ئەگرێ و تێت ئەسرەوێنێ و نیشانەکە ئەیگرێ.
2–کارێزی بەر بنار بوو: مەبەست لە کارێزەکانی بەربناری شاخ و گردەکانی سلێمانییە.
3–بە خەروار: بە خەربار، لە خەرمانەیەکی زۆر فراوانەوە هاتووە.
4–لە مستا: لەو مشتا، لە لەپی دەستا.
5–پڕ لە بازرەقەی شێر بوو: واتە سەفتە سەفتە شێری تیا بوو.
6–شاعیر مەبەستی لەوەیە کە نرخ و بەهاو ڕێز و مەنزڵ تێك چووە و شێواوە هیچ شتی لە شوێنی سروشتی خۆی نەماوە ئەوەتا لە بریتی ئەوەی گوڵ لەناو ئیجانەدا دابنرێ ئەو گوڵانە فڕێدراونەتە ناو ئاگر و توون خانەوە و دڕك و داڵیش و بۆ ئینجانە.
7–خوم: ڕەنگێکی دەسەت کردە و جاران بۆ ڕەنگ کردنی جلو بەرگ بەکارئەهێنرا و بە زۆری "خام" لە خۆم هەڵئەکێشرا.
8–نەنگە: خەوشە، عەیب و عارە، شوورەییە.

# نەوبەهاری

1982

ئەی گوڵی ژاڵە لە گوێی چەم پایزان
ڕەنگت سورمە ڕێژە بۆ دیدە کزان[1]
چاوی ئاواتم ئەوەن لێ کز بووە
هەچ برینێکم هەیە ئاودز بووە[2]
تۆ بە پایز ڕەنگی سوورت سورمەیە
بۆیە شێوەت بۆ خوماران هەر مەیە
من لە پایزدا بەهارم دێتە بەر
بۆیە نرخی تۆ ئەنێمە تەوقی سەر
تۆ گەڵاڕێزان کە بۆ ئەوسا گوڵی
جامی بادەی لێ تکاوی سەرچڵی
بۆیە هەرگیز تۆ لە بازاڕا کەمی
چونکە ئاوێتەی خوڕی گریەی چەمی
من نزیك تۆ جامی هەڵبەست دائەنێم
هەر لە کن تۆ کەللەیی مەست دائەنێم[3]
چونکە تۆ دەرمانی دەردی تازەمی
تۆ کتێبی پڕ گڕی ئەم ڕازەمی
چونکە تۆ شێوەت بەهاری پایزە
بۆیە چاوە گوڵ ڕنینت لێ بزە
تۆ نیشانەی بەختی ناسازی منی
بۆیە ئێستا هەست و هامڕازی منی(3)
من بە ڕاستی پێت ئەڵێم بادەم ئەوێ
جام لەسەر جەم و فرە سادەم ئەوێ[5]
مەستی بادەی هەستی جارانم هەیە
بۆیە ئێستا (ڕێز) بە خزمانم هەیە
پیت و سامانم هەیە، بادەم هەیە
تا بە دامانم هەیە، سادەم هەیە[6]
"گۆشەگیرم" چۆن تریکی ژاڵەمم
بەستە بێژی ئەو شەرابە تاڵەمم[7]
بۆیە ئالودەی شەرابی تفت ئەبم
چونکە پاش هاوار هەیە هیلاك و کفت ئەبم[8]
هەرچی هاوارم هەر بۆ "مەیە"
کەی ئەگاتە بەر دەمم ئاخۆ کەیە[9]
هەرچی هەڵوێستم هەیە هەر بۆ مەیە
چونکە "ڕاستی" خۆی "مەیە" بۆیە هەیە!
بۆیە ئێستا شاخێ سامانم هەیە[10]
بۆیە سەرووم لا پەسەندە و زیندوە
چونکە ڕاستە و بێگرێ ڕاست هەڵچووە
بۆیە شیرینی بە ژاڵەی تاڵ ئەدەم
چونکە ڕوو زەردی بە ڕەنگی (ئاڵ) ئەدەم
من لەناو (جاما) بە (دیدار) شاد ئەبم
هەر بە بۆنی گیان و دڵ ئازاد ئەبم[11]
مەی لە بۆ من چاکە نەك بۆ دوور لە مەی
"گریە" بۆ من باشە نەك بۆ دوور لە (وەی)[12]
کام خوڕی گریان لە سەرخۆ و (هێمنە)
پیشەیی خۆمە و لە خەو (هی منە)
زۆر دەمێکە (گریەکارم) ڕێگەمم
زۆر دەمێکە بێ بەهاری جێگەمم
داخی سەد ساڵەی وەها پێڕشتووم
چی ئەمن خۆشم ئەوێت جێی هێشتووم[13]
دەست درێژم بۆ کەلەپەی مەینەتی
مل درێژم بۆ (قومێ) زەهری پەتی[14]
چاو لە ڕێگام بۆ چەقۆی سەر گەردنم
گوێ قولاغم بۆ هەناسەی مردنم[15]
"گریە" لای من هی دەروونی مەردییە
چێژی فرمێسك شەربەتێکی کوردییە
مەی کە تێکەڵ بوو فرمێسك (شادییە)
(نەی) لە پاڵ بێت، ئەوە (ئابادییە)[16]
(نەی) نیشانەی ئاوەدانی دڵمە من
(مەی) نیشانەی نەوشکۆفەی گوڵمە من
(ای بی محزون نوای ساز کن
نالە دلسوز را اغاز کن
گر ز دوریهما شکایت می کنی
از زبان ما حکایت می کنی
بشنو از نی چون حکایت میکند
واز حدای ماشکایت میکند)

1—ڕەنگت سورمە ڕێژە: ڕەنگت "کل" ڕێژییە، واتە ڕەشی قەترانییە.
—دیدە کزان: چاوی کز و بێ تین، بینایی کزە.
2—هەچ برینێکم هەیە ئاودز بووە: کاتی برین ئاوی بەر ئەکەوێ، پاش ماوەیەك، شوێن زام و برینەکە "کێم و جەراعەتی" تێ ئەزێ و بەمە ئەوترێ: برینەکە ئاودزی کردووە، ئاوی دزیوە، ئاوی تێچووە.
3—کەللەیی مەست: کەللەی خوماری، سەرخۆش.
4—هەست و هامڕازی منی: هامڕاز و هاوڕاز، هاوبەش لە ڕاز و خەما واتە تۆ لە هەست و خەم و نهێنییەکانی منا هاوبەش و هاوکاری.
5—فرە سادە: تەواو ئاسایی، تەواو سروشتی و ڕوون هەر خۆیەتی و تێکەڵ بە شتی تر نەکراوە.
—فرە: زۆر.
—سادە: ئاسایی. بەسیط. پەتی. تەنیا خۆیەتی.
6—تا بە دامان: تا ئاوا دام، بە درێژایی باڵا واتە بە ئارەزووی خۆم هەمە.
7—گۆشەگیر: دوورەپەرێز، خۆلەکەنار گرتوو.
8—ئاڵودەی: هۆگری، ئاشنابوون.
9—هەر بۆ مەیە: هەر بۆ بادەیە، هەر بۆ شەرابە.
—ئاخۆ کەیە: ئاخۆ چ کەتێکە؟
10—شاخێ سامانم هەیە: بە ئەندازەی بەرزی چیایەك سامانم هەیە، واتە زۆر بووە و دەوڵەمەنم.
11—بە دیدار شاد ئەبم: واتە بە بینین و تەماشاکردنت ئەگەشێمەوە و دڵخۆش ئەبم.
12—گریە: گریان..
—وەی: زیان، بەڵا.
13—داخی سەد ساڵەی وەها پێ ڕشتووم: واتە داخ و ڕقی دەروونی سەد ساڵە و کۆنی خۆی ئاوا لێ کردمەوە پێی ڕشتم.
14—قومێ: فرێ.
—زەهری پەتی: ژەهری بێ فرت و فێڵ، ژەهری بێگەرد کە هیچ مادەیەکی دی تێکەڵ نەکراوە و ژەهرێکی پاکە و گەردی تیا نییە و ژەهری ڕووت.
15—گوێی قولاغ: گوێی ئامادەی بیستنە، هۆش و گۆشی لەلای بیستنەکەیە.
16—ئەوە (ئابادییە): ئابادی لێرەدا بە واتای دڵخۆش و ئاوەدانی دڵ و دەروون دێ.

# دیسانەوە نەورۆز

1957

دیسانەوە نەورۆزە بەهارە گوڵی ئاڵە
شەونم بە قەتیسی لەسەر ئەو نێرگسە کاڵە
وەك چاوە چی چاوێ کە بە فرمێسك و کەژاڵە
بۆ تازە بەهارێ
بۆ گەشتی کەنارێ..
هەر چەندە چرۆ و چووزەرەی باغی شنە و شۆ
پڕ نازە بە ئاوازە لەگەڵ شوویی ئاسۆ[1]
بێ سوودە ئەگەر هاڕە نەکا بەستەڵەکی کۆ
بۆ هاژەیی چاوە
بۆ جۆششی کاوە..![2]
زستان دە بڕۆ پەردەیی (تۆف) لادە لە چاوم
من خۆم بە گەلێ وەیشوومەوە تێوە گلاوم[3]
ڕێ چۆڵ کە لە بۆ مێرگی وەکو ئەخشەری خاووم[4]
با بێتە گەشە و گوڵ
بۆ بولبولی سەرچڵ
گوێم لێیە نزیك دەنگی نەی و پۆلی مەلانە
دڵ ڕائەچەنێ بەزم و سەمای دەس لەملانە
شادی گەلی کوردی نەبەزی دۆستی گەلانە
شەڕ دوژمنی وانە
ئاسایشە گیانە!!
ئەی گەل.. ئەوە شەڕخوا هەر خەریکە بە دەس و برد
خاك و شەرەف و ڕۆڵەی مەردی نەتەوەی کورد
بیکا بە خەڵوزیش و ببێتە سوپەر و پرد[5]
بۆ ویستنی دوژمن
بۆ هێرشی مردن..!
تۆش.. بەسیە ئیتر دوو دڵی و ترس و بەهانە
ئەمجارە لەناوچوون و بە ملیۆنە نەمانە
ئاسایشە ڕێی ڕزگاری و باخی ژیانە
بۆ دەنگی بە سۆزێ
بۆ گشت گەل و هۆزێ



1- چووزەرەی باغ: گۆپکە و چڵی درەختی باغ
-شنەو شۆ: شەووق و شەفاف یان بە واتای بە کەیف دێت، دیارە گەڵای لق و پۆپی سەرچڵەکانی سەوز و تەڕ بێت و شنەی با بیلەرێنێتەوە، پێی ئەوترێ: ئەو درەختە لە هەوا و ئارەزوو و شەوقی خۆیایەتی.

2–هاڕە: کە شوشە یان قاڵبە سەهۆڵ ئەشکێ و ئەکەوێتە خوارێ: ئەڵێن هاڕەی کرد.
–بەستەڵەکی کۆ: مەبەست سەهۆڵ بەندانی سەر چیای سەختە.
جۆششی کاوە: واتە بۆ جۆش و خرۆش و دەروون، کوڵانی کاوە.. گەلێ جار بە واتای سەرگەرم و دڵ خرۆشاو دێت.
3–تۆف: سەرماوسۆڵەیەی سەختی باراناوی واتە بایەکی سارد بە دەم باران بارینەوە.
–وەیشوومە: بە واتای کارەساتی سەختی سروشتی دێت.
–تێوەگلاوم: تووش بووم، دووچاری ئەو کارە بووم،
4–ئەخشەری خاووم: ئەخشەر، گیایەکە لە کوێستانە سەخت و ساردەکان ئەڕوێ و ناسك و بۆن خۆشە، ئەخشەری خاو، بۆ زوڵفی خاو بەکارهاتووە.
5–سوپەر: قەڵغان هەر شتێ بەرگری خۆپارستنی پێ بکرێت، پێی ئەوترێ سوپەر.

## شەبەق

1957

شەبەق ڕەنگەکەی سوور و خوێنینە
موژدەی ڕووناکی ڕۆژگاری ژینە[1]
بۆ لەشی کش و ماتی بێ دەنگی
(دەرزی) جووڵەیە و ئاگری تینە[2]
بۆ جەستەی کفتی ئازاری مەینەت
مەرهەمی شەوق و دەرمانی بینە[3]
بۆ دنیای (تاری) دەستە ئەژنۆیی
بووکی مرادی سووار بووی زینە..![4]
بۆ گیانی تاڵ و درێژی شەوگار
شەکری هیوا و شانەی هەنگوینە
بۆ خانەی پەست و قووڵی مەلوولی
چەپکە گوڵێکی بە پێکەنینە
بۆ چاوی قورس و خەواڵوی سستی
بروسکەی تیژی ڕاچڵەکینە..![5]
شەبەق بۆ دڵی ڕەشی تاریکی
تیرێکی تیژ و سەخت و ژەهرینە
بۆ گیانی قورس و خوێناوی ستەم
تیغی دوو دەمی مشت ئاسنینە
دە ئەی شەبەقی شادمانی کورد
هەڵبێ.. کوردستان چاوەڕێ تینە

1–شەبەق: بەری بەیان، کە ڕووناکی خۆر شەق بە تاریکی شەو ئەدا، بەری بەیان هەمیشە، ڕوناکی پەخش ئەکا.. مەگەر کاتی خۆر هەڵدێ تیشکی ئەو خۆرە ئاڵتوونییە گزنگەکەی پەخش ئەکا.. شاعیر وێنەیکی جوانی شیعری نەخشاندوە.

2–لەشی کش و مات: ساتێ مرۆڤ خەوی لێ ئەکەوێت و ئەنووێ، لەشی کش و مات ئەبێ و لە جووڵە ئەکەوێت.
3–جەستەی کفتی: لەشی ماندو و شەکەتی.. ساتێ مرۆڤ هیلاك ئەبێ، ئەوترێ کفتە.
4–بووکی مراد: بووکی ئاواتەخواز.. کە مرۆڤ عەشق و شەیدای شتێ ئەبێ و پێ ئەگات ئەڵێن: ئاواتی هاتە دی.
5–ڕاچڵەکینە: مرۆڤ کە لە خەو هەڵئەسێنرێ، بە تایبەت بە دەنگی بەرز بانگ کرێ یا ڕاوەشێنرێ لەو ساتەدا بەو ڕاپەڕینە ئەوترێ ڕاچڵەکان.

## ترووسکە[1]

1982/7/11

ئەی ترووسکە:
بەرەو کۆ دێین بۆ ڕێی ژین[2]
بە چوار وەرزە پەل ئەگێڕین: بتبینین
دەور و پشتمان پەیکوڵە..!
پەل ئەگێڕین:
پێمان ڕووتە.. تێشووی ڕێمان سکڵە[3]
هەنا راوە:
سوور بوونەوەی سەر سنگمان
دام و داوە، جێگە چینەی ناوچنگمان
قوڵپی نزیك:
گەردی داپۆشراومان
مەیلە و پاڵە، تکەی دڵی گوشراومان
زەردی دوکەڵ:
توێی.. سەرپۆشی قوڕاوی
یەخەی ونجڕ کراس شیتاڵ بڕوای
بەفر و خوێنە:
بەفر و خوێنە خۆراکی بەستەڵەکمان
بۆ مانەوەی ڕەگێکی ڕەچەڵەکمان[4]
بۆ مانەوە:
زەرد و سوورە.. قوربانی
پەلکەزێڕینەی سنوورە گۆرانی
هانا گڕە:
گڕ چاوگە.. خەرمانە
دانەوێڵەی قەد پاڵەکان فرمانە
فرمان دارە
دار بەری من و تۆیە
گەر نە گڕێین لوتمان لەسەر ئەژنۆیە
کورنووش بردن:
یاسای دەوری کەوانە
کەی دیلێتی.. ئەنجامی کورد زمانە..!

کەی دیلێتی:

بۆ میللەتان.. ڕەوایە..؟؟

لە کوێ زەهر بۆ نەخۆشی دەوایە.؟؟

ئەی تروسکە:

ڕووە و تۆ دێین بۆ شادی

ئینجیل مانە سووتاندن یا ئازادی

1-لە گۆڤاری "کاژاو" ی ژمارە (1) ساڵی 1984دا لە لایەن قوتابخانەی ناوەندی کاژاو لە سولەیمانی بڵاوکراوەتەوە.

2-ترووسکە: تیشکی شەوقی ڕووناکی کز و بێ هێزە.

3-دەوروپشتمان پەیکۆڵە: پەیکۆڵ: گژوگیایەکی بەهارییە واتە دەوروپشتمان بەگیا پەیکوڵی بەهاری تەنراوە.

4-بەستەڵەك: شەختە، سەهۆڵ بەندان.

-ڕەچەڵەك: بنچینە و بنەوانی ڕەگەزی خێزانی و نەتەوە. ئەسڵ و فەسڵ



## قوربانییەکانی نەتەوە

1953

بیخەرە گەردن، پەتی جەڕاووت
بیخەرە سەر پشکۆ نێچیری ڕاووت[1]
گیرکە لە جەستە نینۆکی سوورت
بیگەیەنە گوێ زەمزەمەی دوورت[2]
بیخەنە.. ژووری تاریکی زیندان
شەبەق بخەرە جێگە قەپ و دان[3]
گڕ بەر بدەرە خاشاکی لاشە
گۆشت هەرزان بکە بۆ داڵ و واشە..![4]
ئێسقان ورد بك سەر بپەڕێنە
جومگەی ئەم و ئەو لێك بترازێنە[5]
بڕە، بکوژە، بکە بە سووتوو
فوارەی خوێن بخە ناو قوڕگی تینوو
مەست بە بە جەرگی برژاو و پارە
بە خوێن ڕووناك کە ئەم شەوە تارە..!
با.. تەنگەی ئەستوور، چەشی دارکاری
مەستی ئازار دان پێی گوناهباری[6]
هەڵپەڕێ لەسەر ئێسکی ئەم و ئەو
قاقای تێکەڵ کا لەگەڵ قاسپەی کەو
با.. پیشەی سنگی کراو بە دارا
بکا بە تاری بەزمەکەی دارا[7]
با. ئەم بسووتێ، ئەو ببێ بە خۆڵ
ئەم بە قاورمە، ئەو بە شیپەی چۆڵ[8]
چی لەوە.. مێزی ڕازاوە ئەوێ
دەسکاتە ملی قەد باریك شەوێ
زڕەی پیاڵە و فنجان مەبەستە..!
شەرەف تۆ بڕۆ هیچ ڕامەوەستە..!
با خەڵکی هەموو قەڵاچۆ بکرێ
تەقەلا و ڕەنج و سامانی ببرێ
سا ئەوی دەستی دار بگرێ بە حاڵ
لە گڕی شەڕدا بێ بە کۆی زوخاڵ[9]
لەبەر مەرامی پیسی داگیرکەر
جەردەی (ئایەتی) خوێن ڕشتن لەبەر[10]
بمری نیشتمان، بسووتێ میللەت
بژی ژێردەستی، بمێنێ زیللەت..![11]
بەڵام.. پشکۆی ژێر خۆڵەمێش و ژیل
گوێ هەڵخراوی دەنگی زەنگ و زیل
ئەویان مەڵاسی بای تۆڵەسەندن
ئەمیان چاوەڕێ خرۆشی "هەستن"[12]

کە ئەو هەڵیکرد ورد گەشایەوە
ئەمیان ئاوازی دەنگی دایەوە
ئەوسا نۆرەی گورز ئەکەوێتە دەس
گەلی داخ لە دڵ بە بەزم و هەوەس[13]
کۆزەر و پەربای وا ئەکا بە شەن
چەرخ نەیدیبێ مەگەر بە دەگمەن[14]
ئەوسا هەچ کەسێ لە مەیدانا مرد
جێی شانازییە بۆ نەتەوەی کورد

1–پەتی جـەڕاوت: جـاران لـە دوای بڕیـاری دادگـا گـەر یـەکێ بـە تاوانبـارێکی زۆر گـەورە بزانرایـە و سـەخترین بڕیــاری دوایــی دادگــا خنکـاندن بـوو، ئـەو تاوانبـارە سێدارەی بـۆ هەڵئـەخراو بـە پـەتا ئـەکرا، پەتی جەڕاوت نیشانەیە بۆ ئەو پەتەی مرۆڤی پێ ئەخنکێنرێ.

2–گیرکە: قایم کە.

جەستە: لەش، ئەندام کۆی مرۆڤ.

نینۆکی سوورت: ئەو نینۆکە خوێناوییەیە کە بە خوێناوی جەرگی ڕۆڵەکانی میللەت دەست و پەنجەی ئیمپریالیزمی پێ سوور بوو.

–زەمزەمـەی دوورت: بـەزم و زەمزەمـە: واتـە ئـەو کـار و کـردەوە سەرسوڕهێنەرانەی لە سەرتاپای وڵاتدا ئەکرێ.

3–شەبەق: دەلاقە، کون.. مەبەست برینێکی گەورەی جەستەیە.

4–خاشاکی لاشە:

خاشاک: پوش و کار و کۆڵ.

خاشاکی لاشە: بە واتەی ئێسک و پروسکی سووتاو یان خۆڵەمێش و سووتی لاشەی سووتاو.

واشە: باڵندەیەکی بەهێزی دەنوك تیژی گۆشت خۆرە.

5–بترازێنە: لێك بکەرەوە، لە شوێنی خۆی دەری بهێنە.

6–تەنگەی ئەستوور: ناوقەدی ئەستوور.. مەبەست لەو ستەمکارو خوێن مژانەیە کە لەسەر هەوڵ و تەقەلاو هێزی چەوساوەکان ورگیان زل ئەبێ و قەدیان ئەستوور ئەبێ.

7–با پیشە سنگی کراو بە دارا: مەبەست لەو تێکۆشەرانەیە کە کار و پیشەیان قوربانییە و ئەکرێن بە سێدارەدا.

8–قاورمە: جـاران لەبـەر نـەبوونی هۆیـەکانی پێشـکەوتن و ژیـانی گوزەرانێکـی باشـتر و سـەختی و دوور و درێـژی زسـتانیش لـەولاوە بوەستێ، لەبەرئەوە زۆرەبەی دانیشتوانی شاری سولەیمانی لە هاوینانا مەڕ (بەرانیان) دائەبەست و تا تەنگەی پـایز بـەخێویان ئـەکرد بـەران قەڵەو ئەبوو، ئەوسا سەر ئەبڕاو گۆشتەکەیان بە پارچە پارچەیی لەناو ڕۆنــە دووگــدا نیمچــە ســوورکردنەوە ســوور ئەکرایــەوە و پــاش ساردبوونەوە لە هێزەدا سەری بە ڕۆنە دووگ دائەپۆشرا و بۆ زستان هەڵئەگیران بەکار ئەهێنرا، ئەمە پێیان ئەوت: قاورمە.

9–سا ئەوی دەستی دار بگرێ بە حاڵ: مەبەست لەوانەیە کە لەبەر بـێ هـێزی لاوازی دەسـتی بـە ئاسـتەم دارئـەگرێت، ئەمــە زیــاتر ئـەو کوڕوکاڵە تازە پێگەیشتوانە ئەگرێتەوە کە گەنگە موویان لێ نەهاتووە.

دار: لێرەدا بە واتەی ڕێگای هەوڵ و تەقەلا و تێکۆشانە.

–بێ بە کۆی زوخاڵ: ئەوەند بسووتی ببێ بە خەڵووز.

10–مەرام: مەبەست.

11–ئـەم بەیتـە شیعرە بـە زمـانی داگیرکـەر و سـتەمکار و نـەیارەوە وتراوە.

نابێت ئـەم بەیتـە لـە تێکڕای شیعرەکە دابـڕێ و بـە تـەنیا بوتـرێ.. دەنا واتەکەی ئەخنکێنرێ و وەك ئایەتی: (ولا تقربوا الصلاه..) لێ دێت گەر بەشەکەی دوای نەوترێ کە ئەمەیە.. (ان کنتم سکاری). مەبەست ئەوەیە: داگیرکەر هەر زمانی خوێن ڕشتن ئەزانێ ئیتر با میللەت بمرێ.

12 –مەڵاس: خۆی مەڵاس داوە، خۆی مت کردووە، خۆی مات داوە، بێ چرکە، بێ چرپە، بێ سرپە.

–خرۆش: هەڵچوونی کەف و کوڵی سۆزی دەروون.

13–گورز: بەو دارە ئەوترێ کە سەرێکی کەمێك خڕ و ئەستوورە و بۆ لێدان بـەکار ئـەهێنرێ، گـەلێ جـاریش گـورز بـەو کـارە ئـەوترێ کـە (فرمان)ەکەی تیا بەجێ ئەهێنرێ. وەك ئەڵێن:

–گورزی خۆت بوەشێنە.

–نۆرە گورزی خۆمە.

14–کـۆزەرە: کاتــێ دانەوێڵــە بــۆ جیاکردنــەوەی کـار و کۆتەڵەکـەی شەن و کەو ئەکرێت ئەمە لەبەر "با" بەجێ ئەهێنرێ.. دوای ئەوە گەلێ جار بە "بێژنگ" "کەو" بەکارئەهێنرێ بۆ گرتنی سەرکۆزەرەکە واتـە ئەو گەنمە یا نۆك یـان نیسـکە ئەخرێتـە بێژنگەکـەوە و گێـژ ئـەدرێت هەرچی دار و کاو کۆتەڵە سەرئەکەوێ بە چنگ ئەگیرێ و فڕی ئەدرێ ئەمە کۆزەری پێ ئەڵێن.

*ئەم شیعرە لە سـاڵی 1954دا لـە ڕۆژنامـەی ژیـندا بڵاوکراوەتـەوە... ئەگەرچی ساڵی 1953 وتراوە.

نەتـەوەی زینـدوو ئـەنجامی خـەبات و تێکۆشـانی بێوچان قوربـانی پێشکەش ئەکات و باجی ئەو هەوڵ و تەقەلایەی ئەدات.

## سولەیمانی

1968

مامزی ناو قامیشەڵان
گوێچکەی تەپی بۆ ڕاوەشان[1]
وەکو "شۆخێ"
ملی بەرزی بۆ هەڵبڕێ
نیگای ڕەشی بۆ دوور فڕی
لە کەلی بەردەمی خوڕی[2]
بە مرقەی.. باڵندە تەڕی
وتی: هەستە خرمەی سوارە[3]
دەسە جڵەو بەرەو خوارە
وا دیارە سەد بە هەزارە
ڕێچکەی لەشکری دوایییە
دەنگی تەپڵی پاشاییە[4]

## سەرضنار

مامزی ناو قامیشەڵان
سمی تیژی لە زۆنگ چەقان[5]
لەسەر چیمەن جێ پێی دیارە
لووتی "ڕەوەی" بەرەو خوارە[6]
بە گوومەتە و زاق و باز
دوورکەوتەوە لە تیر و باز[7]
کاتێ گەیشتە سەرچنار
دی.. پەیکەری جوانی بەهار
جەستەی شەنگی ڕازاوەیە
سروشتی تیا حەساوەیە!
ئیستێکی کرد..
قۆچی بۆ سەر قەبرغەی برد[8]
وتی: مەڕۆن
ڕوخساری شەو..
بەم ئاوی ژیانە بشۆن[9].
تازە تیری سوارەی بەیان
تێناپەڕێ لە کانیسکان[10]
تێناپەڕێ ناگاتە ناو
ڕەوەی تەڕەی لانە شێواو!

## شاری تازە[11]

بۆ بەیانی
بۆ سبەینێ.. مامز ڕوانی
تەقەی تەورە..
ئەگرمێنێ.. ئەڵێی هەورە
ئەبارێنێ پەلی پەڕاو
بە بار.. بە تاو
داربڕینە
لە هەموو لا هەڵپەڕینە[12]
گوریس لە دوو لا لە دارە
وەك مێروو لە ڕێچکەی بارە!
ئەی کۆتری تینووی گوێی ئاو
چ باسە لە لانەی شێواو؟

## لاثەرقیەکی شاردراوة

نیازی شەڕە یاخو ڕاوە؟
ئەم قیامەتە هەستاوە
ئەبێ دیسان لمۆزی "......."
تینوو بێ بۆ خوێنی ئەستۆم!
بۆ سووتاندن بۆ خنکاندن
بۆ درەختی زل پەڕاندن[13]
یا هەمدیسان گورگی..
برسییە بۆ لەش و جەستەم؟
ئەبێ چی بێ..
ئەبێ چەن گوڵ هەڵوەری بێ
وا باخەوان وێنەی جاران
کەوتۆتە دەنگدانی یاران؟

وەڵام
ئەی مامزەکان.. گوێچکە هەڵخەن
شاختان لەناو شاخی کەڵ خەن
شەڕە قۆچ کەن..
ئەوا پایتەخت..
گوێزرایەوە بۆ شوێنی تەخت
بۆ ئەم دیوی قەڵاچوالان
بۆ تەنیشتی گردی سەیوان.![15]

## شادی
## وا شاییة

وادەی ئازار ڕەهاییە[16]
ئای چەن خۆشە
هەموو شتێ بە پەرۆشە
بۆ ئەم کاتە بۆ ئەم ساتە
بۆ ئەم دەوری فەڕ و هاتە[17]
وا بەڵقیسی دار ئەرخەوان
بە بووك برا بۆ سلێمان![18]

## ناسۆر و داخ

ئەی نازەنین
دەم و لێو پێکەنین
بەو یادەوە..
دەست و پەنجە بە بادەوە
بێنە جامێ لەو شەرابە
مەزەم لایە.. دڵ کەبابە.!
بۆ ڕابوردوو
بۆ خەوێکی لە دەس دەرچوو!
ئەوا ئێستا..
گیان ناسرەوێ لەناو پێستا.!
لە کێ پرس کەین..
کام سەری تازە وەڕس کەین.؟
بۆمان باسکا،..
تۆسقاڵێ مێشکمان کاسکا
دڵی "یاقووتی" ئەم شارە
بۆ وا بۆتە پارە پارە[19]
بەرگی ئەم مەرزە ڕەنگینە
بۆ وەکو پیرۆزە شینە؟[20]



**پەراوێزەکان:**

1 –مەبەست شاری سولەیمانی ئێستایە کە لە لایەن ئیبراهیم پاشای بابانەوە بە مەبەستی گواستنەوەی پایتەختی بابان دامەزرێنراوە.. شاری سولەیمانی کە بە یەکێ لە هەرە شارە پێشەنگ و قەشەنگەکان ئەژمێرێ لە ساڵی 1784دا دروست کراوە، لە چاو کورتی تەمەنیا پێشکەوتنی بێهاوتا و داهێنانی نوێی لە تێکڕای بوارەکانی ژیانی ئەدەبی و ڕۆشنبیری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و سەربازی و ئابووری و ئاوەدانی و شارستانیەتی بە خۆیەوە بینیوە کە جێی سەرنج و ڕامانی دۆست و نەیاری کوردە..!!

–مامز= ئاسک.

–گوێچکەی تەپی: گوێچکەی شل و شۆڕی.

2 –کەڵ ئاسکی کەڵە، واتە ئاسکێکی نێری قەیرە و بەهێز.

3 –خرمەی سوارە: واتە خرمەی ناڵی پاشنەی وڵاخی بەرزەیە.

4–دەنگی تەپڵی پاشاییە: جاران وا باو بووە کە پاشاکان ڕوویان لە هەر لایەك بکردایە پێشەنگی پاشا تەپڵیان لێ ئەدا.. وا دیارە کە ئیبراهیم پاشاش لە هاتنی بۆ دامەزراندنی شاری سولەیمانی تەپڵی پاشایانەیان لێداوە.




5-سەرچنار: هاوینەهەوارێکی خنجیلانەی قەشەنگە و نزیکەی سێ کیلۆمەتر لە شاری سولەیمانییەوە دوورە و کەوتۆتە ڕۆژئاوای شارەوە.

-سمی تیژی: نووکی پێی (ئاسك)ە.

6-ڕەوە:" بە کومەڵە ئاسك ئەوترێ.

7-باز: ئەو باڵندەیەیە کە پاش پەروەردەکردنی بۆ ڕاوکردن بەکارئەهێنرێ.

8-ئێستێکی کرد: هەڵوێستەیەکی بۆم کرد، کەمێك وەستا، ڕاما. قۆچی: شاخی. قەپرغەی: کەلەکەی.

9-ڕوخساری شەو: شێوەی ئەو بەم ئاوی ژیانە بشۆن: وەك دیلان خۆی ئەڵێ: ئیشارەتە بە قەسیدە بەناوبانگەکەی نالی قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مرور.

10-کانێسکان: لە کانیی ئاسکانەوە هاتووە و ئێستا گەڕەکێکی گەورەیە لە ناوەڕاستی شاری سولەیمانیا.

11-شاری تازە: مەبەست لە دامەزراندنی شاری سولەیمانییە.

12-دار بڕینە: سەبارەت بەم دار بڕینە- دیلان- پەنجەی بۆ گەشتەکەی -میستەر ریچ- بردووە کە ساڵی 1820 هاتۆتە سولەیمانی وتویەتی (لە عەزیز بەگی مەسرەفم پرسی دەور و بەری شار بۆچی دار و درەختی ئەوەندە تیا نییە.. وتی: تا تاسلووجە هەمووی دار بوو، بڕاو شاری سولەیمانی پێ دروست کرا.

13-بۆ درەختی زل پەڕاندن: وەك -دیلان- ئەڵێ: ئیشارەتە بۆ قەسیدەکەی -سالم- لە وەڵامی -نالی-یا کە ئەڵێ: (ڕۆمی ئەوەندە شوومە لە شەخسیش ئەدا زەرەر).

14-باخەوان: خاوەن باخ، ئەوەی پەروەردەی باخ ئەکا و لە ئافات ئەیپارێزێ.. لێرەدا باخەوان، بە خاوەنی ئەمارەتی بابان ئەڵێن، واتە حاکمی بابان.

15-قەڵاچوالان: شارۆچکەی قەڵاچوالان بەر لە سولەیمانی پایتەختی کۆنی ئەمارەتی بابان بووە ئەکەوێتە نێوان زنجیرە چیای ئەزمڕ و چوارتاوە نزیکە لە ژوورووی شاری سولەیمانی.

16-وادەی: کاتی، ساتی -ژووان.

-ڕەهایی: بە فراوانی، بەربڵاوی.

17-دەوری فەڕو هات:

-دەوری: دەم و کات و زەمانە، واتە کاتێکی لەبار و گونجاوە.

18-بەڵقیس: -دیلان- ئەڵی ناوهێنانی ئەم بەڵقیسە، لە شیعرەکانی پیرەمێردی نەمرەوە هاتووە کە ئەڵێ: بەیانی بوو لە خەو هەڵسام کە ڕوانیم بەفرە باریوە سولەیمانی ئەڵێی بەڵقیسە تارای پۆشیوە.

19،20-لە هەردوو ئەو بەیتە شیعرییەی -دیلان-دا پەنجە بۆ ئەو شا بەیتە شیعرییەی مەحوی براوە کە ئەڵێ:

"لە کێ پرسم بۆ پڕ لە خوێنی حەسرەتە یاقووت

عەزا پۆشی چییە و بۆچی جلی پیرۆزە وا شینە

# مامة کورِنوو

طردی سةیوان

1957

مامه کوڕنوو ڕاکشاوی گردەکەی سەیوانەکەم
سەر ڕەحەت، دڵ بێگرێ، گوێ شلکە بۆ داستانەکەم[1]
سەیرە، بەزمە، هەڵپەڕینە، پڕ لە قاقا و خەندەیە
نەعرەتەی گوێ کەڕ ئەکا، جۆش و کوڵی سەیرانەکەم[2]
ئەرخەوان سوورە، بەهارە، گوڵشەنە، ڕازاوەیە
دەشت و کۆ ڕەنگین و پڕ شۆیە وەنەوشەی یانەکەم[3]
خەرمەنی لالە لە کۆهساران و پێوەشت و نشێو
سوور ترە لەو خوێنە باریوەی کوڵی گریانەکەم[4]
دلبەران سرك و بەتاز و ڕەوتی نەرم و ئیستەکەی
سەد توانج ئەگریتە ئاهووی دەشتەکەی شێروانەکەم[5]
هەڵبڕە چاوی نومایش تێر سرنجی ورد بدە
وەك بەجێت هێشت وا نەماوە شارەکەی جارانەکەم[6]
ئەو بەهارەی تۆ بەجێت هێشت پڕ برینی تازە بوو
پڕ لە ئافاتی لەپڕ بوو بۆ گوڵی ئینجانەکەم[7]
ئەو گوڵەی ئاواتی کورد بوو بێتە پشکووتن دەمێ
ڕایوەشێنێ بای شەماڵی نەرمی کوردستانەکەم[8]
ئەو کەسەی دەستی ئەنایە بین و قورگی ئەو گوڵە
چنگی خوێناوی ئەنایە ناو دڵە پڕ ژانەکەم
ئێمە ئارەق ڕشتن و بازوو وەشاندن، بێخەوی
ئەو گڕ و پشکۆی ئەخستە ژێر بنی خەرمانەکەم[9]
ئێستە وا خۆی دا ئەنێ بۆتە فریشتەی ئاسمان
بۆتە دوکتۆر و برین پێچی برینی گیانەکەم
مامە کوڕنوو چی بڵێم زیاتر لەوەی (خالص) ئەڵێ:
(فێست و ڕێوی و مێژەر و مەیموونە سەیری با نەکەم[10]
وەك وتم: سەیرە لە بانە یا وەکو نالی ئەڵێ:
زیندەگیم تاڵە کە زەلکاو بێ تیمارخانەکەم..!

ئەحەی کوڕنوو: ناوی ئەحمەدی کوڕنووە، لە زەمانی کاك ئەحمەدی شێخا (نۆکی کوڵانووە، لەبەرئەوەی پیاوێکی خۆش مەشرەب، قسەخۆش و حەرەکاتی سەیر و سەمەرەی کردووە و بۆتە هۆی بەزم و پێکەنین و خۆشی، کاك ئەحمەد بردوویەتی بۆ حەج، پیاوێکی عاقڵ و هۆشمەند بووە.. گاڵتەی بە ناهەمواری زەمانە هاتووە. ئەحمەدی کوڕنو: خەڵکی شاری سولەیمانییە و هەر لە شاری سولەیمانیشا کۆچی دوای کردووە.

1-سەر ڕەحەت: مێشك هێمنە و بە هیچ کارێکی ناڕەواوە خەریك و ماندوو نییە.

-دڵ بێگرێ: دڵ و دەروون هیچ گیر و گرفتێکی تیا نییە.

-گوێ شلکە: گوێ بگرە، ببیستە.

2-نەعرەتە: بۆ دەنگ و هاوارێکی بەرز و بەهێز بەکاردێت وەك ئەڵێن: نەعرەتەی شێر یا نەڕەی شێر.

3-دەشت و کۆ: دەشت و چیا.

-پڕشۆیە: تەڕ و تووشە.

-یانەکەم: خانەکەم، خانووەکەم.

4-کۆهساران: شاخ و کێوەکان.

5-سرك: ڕانەهاتوو، دەستەمۆ نەبوون.

-ڕەوتی: ڕۆیشتنی.

-ئێستەکەی: وەستانێکی ساتەوەختی.

-ئاهووی: ئاسکی، مامزی.

-دەشتەکەی شێروانەکەم: مەبەست لە دەشتی گەرمیانە و کەوتۆتە نێوان قەڵای شێروانەی لای دەربەندیخان و کفری و کەلار.

6-چاوی نومایش: چاوی بینایی و تەماشاکردن.

-شارەکەی جارانەکەم: مەبەست لە شاری سولەیمانی نازدار و پیرۆزە.

7-پڕ لە ئافاتی لەپڕ بوو: واتە پڕ بوو لە زیان بەخشین و کاری ترسناکی کتوپڕ. زۆرجار ئەوترێ: ئەم لافاوە بێ ئافات بێ واتە بێ زیان و ترس بێت، بێوەی بێ.

8-بێتە پشکووتن دەمێ:

دەمێ: ساتێ. واتە بۆ ساتێك بپشکووتێ.

9-بێخەوی: بێداری، بەخەبەر، لێرەدا بە واتای ئێشکگرتن دێت

10-خالص: نازناوی شیعریی شاعیر.



# شێخ مەحمودی زیندوو

1956

پایز.. خەزانی تەماوی و مەنگە
گەڵا لق پۆپ خونچە بە ژەنگە[1]..!
ئاسمان نە شینە نە پیرۆزەیی
نە شەو جریوەی ئەستێرەی شەنگە[2]
نە سروەی شەماڵ نە سەدای مەلە
چاوە وشك و ڕەش بە بێ ئاهەنگە[3]
ڕۆژ كە ڕووناكی دەری سروشتە
تەرازووی تیشكی نەوی و لاسەنگە[4]
تەلی تار خاوە بێ سۆز و سازە
شمشاڵ لەگەڵ فوو بە شۆڕ و جەنگە[5]
ئەگەر پێكەنین ببێ بە خەنجەر
لای گوڵ خەندەران شەق بردن نەنگە[6]
پۆلە چۆلەكەی مۆڵی ئێواران
كڕ و كش و مات وڕ و بێدەنگە[7]
سەرچنار ڕەشە ڕەشتر ئاسمانی
پرچی ژاكاوە چرە زەبەنگە[8]
بولبول بێ ئارام بە بێ سرەوتە
دونیای فراوان لای گۆڕی تەنگە..!
خاڵ خاڵی لوتكەی شیرین و هەڵگورد
لەگەڵ فرمێسكا تۆواوەی پەنگە[9]
پشتكۆ تەمی نارد بۆ ئارارات
هەناوی ئەزمڕ بە كاژاو بەنگە[10]
بەڵام كوردستان با لە شینا بێ
گوێ هەڵخراوی ئاوازی زەنگە[11]
كورد با سەراپا ماتەم دابگرێ
جۆش و خرۆشی وەك پوورە هەنگە[12]..!
سیا كەژ سیا، سیا كێوانە
سیا بەرگ دیارە هەر هەورامانە[13]
لە كێ بپرسین سۆراخی ڕاستی
دیارە نزیكتر هەر بەرانانە[14]
بەرانان دەخیل دراوسێی دڵسۆز
ئێستە ئەو پەرتكێی لا میوانە[15]..؟
هەواڵی پرسە لە داری كەلی
شێخ لەوێ ماوە یا لە سەیوانە..؟؟[16]
ئێستە سێبەری سەر هەستەی كفنی
هەتاوی سوورە یا ئەرخەوان؟
ئێستە پێخەفی نەرم و نۆڵی شەو
بەردە یا خاكی كانی‌ئاسكانە؟[17]
بەردە قارەمان لە جێی خۆی ماوە
هەر لە دەربەندە یا لە پیرانە؟[18]
ئێستە ئاوباریك وەك بوومەلەرزە
هەر هەڵئەلەرزی یا لە وەستانە..[19]
كوا شێخ؟ كوا نەوەی ئەحمەدی كاكی
كوا نەبەردەكەی ئەم نیشتمانە؟[20]
بەرانان دیارە قوڕگت گیراوە
چاوت لێخنی خوڕی گریانە
سەرت چەپۆكی كۆچی بێوادەی
شێخ خولی داوە سستی فغانە
بەڵام.. بەرانان گوێم لێڕاگرە
من كوردم كوردیش گەلە، ئینسانە
هەزار ئەوەندە بخرێتە بینی
دەستی گەردوون و چنگی زەمانە
كورد شۆڕە سواری وەك شێخی بوو بێ
سەر نەوی ناكا لە بۆ بێگانە
پایز.. خەزانی تاریك وتاڵە
یا فڕەی قەلە یا هاشەی داڵە
تروفتەی (دەوران) تیژ و بە باڵە
بەسەر (شەهێنی) كوردانا زاڵە[21]
سەروو دەمێكە باخی هیوامان
گۆپكەی درەختی هەر كرچ و كاڵە
ڕێگەی بەر دەممان ماوەیێ تەختە..!
ئەوەندەت زانی پڕ چۆڵ و چاڵە
نە شەو ئاسوودەین، ڕۆژیشمان درێژ
بەخت سەرنگوون حاڵمان ناحاڵە[22]
هێشتا برینێ تیمار ناكرێ
كەچی (شەبەقێ) هاوار بە حاڵە
بە ڕاستی چەرخ بێ بەزەییانە
بەم گەلی كوردە باش ئەكا گاڵە[23]
بەڵام ئەی پایز ئەی گەڵاڕێزان
تۆش گوڵی ئاڵی سەرداری ژاڵە
شێخ.. با ماڵ ئاوا لە كوردستان كا
ئەم خاك و خەڵكە بخاتە ناڵە
ئێستە كوردستان ئامانج و سەودای
لە بۆتەی سەختی دواڕۆژا قاڵە
پایز ئاخری گەڵا ڕێزانت
وورووژمی تیژ و توندی خەزانت
كزەی بای ساردی دەمە و بەیانت

گەردو لوولی ڕەش سەر لووتکەکانت
ئالأیە گەردن سەرۆکی ناشاد
کردی بە نێچیر مەرگی دەورانت
کەوابوو (سەرۆك) مەحموودی کوردان
سووك لێکی بنێ پێڵووی چاوانت
بنوو لە باوەش دایکی دڵسۆزا[24]
بۆی هەڵبڕێژە دەرد و هیجرانت
لەگەڵ یەکتری بکەونە گوفتار
ئەو بە ئیشارەت تۆ بە زمانت
بۆی بگێڕەوە ڕەنجووری کوردان
پیشانی بدە برینی گیانت[25]
بنوو نووستنی دوای هیلاکی ڕێ
پرخەت بگاتە گشت کوردستانت
ئەو ڕێیەی کە تۆ گرتت لە ژینا
ئێستەش بە جێت هێشت بۆ ڕۆڵەکانت!
کوردستان.. بگرە چەپکە نێرگسێ
سووك دایبهێڵە و بیخە گوڵدانت
با.. بۆنی خۆشی هەتا هەتایە
ببێ بە مایەی شەوکەت و شانت
با هەنگی لاوی نیشتمانپەروەر
ئەو بۆنە ببا بۆ بەردەکانت
لێی دروست بکا شانەی هەنگوینی
مەبەست و بڕواو جۆش فەرمانت

**پەراوێزەکان:**

بە بۆنەی کۆچی دوایی (شێخ مەحموود)ەوە وتراوە.

1–شێخ مەحموودی زیندوو: مەبەست لەوەیە: هەرگیزاوهەرگیز کرداری جوامێر و دڵسۆز و کوردپەروەرانەی شێخ مەحمووود لە دڵدا زیندووە و ناوی کوێر نابێتەوە.

–گەڵا لق و پۆپ خونچە بە زەنگە: لە دوا تەمەنی وەرزی پایزدا کە سەرما لە گەڵا و گوڵ ئەدات لە بریتی زەرد بوون، سوور هەڵئەگەڕێ

2–شەنگە: جوان، شۆخە.

3–سەدای مەلە: دەنگی خوێندنی مەل، ئاوازی مەل و باڵندە.

4–نەوی و لاسەنگە:

نەوی: نزمە.

لاسەنگە: لارترە، خواربۆتەوە. تایەکی بەرز و تایەکی نزمە.

5–شمشاڵ لەگەڵ فوو بە شۆڕ و جەنگە:

شۆڕ و جەنگ: شەڕ و شۆڕ، پشێوی و ئاژاوە. سەرجەم مەبەستی دێڕەکە ئەوەیە کە ئاوازی شمشاڵ هەمیشە خۆشی و چێژ بە هەستی مرۆڤ ئەبەخشێ کەچی ئێستا پێچەوانە بۆتەوە.

6–نەنگ: عەیب و عار، شوورەیی.

لەم دێڕەدا مەبەست لەوەیە کە گوڵ خەندەران یان لای ئێمە گوڵە (لفکەشامی) و مەشهوورە کە بەرامبەری بوەستی و بیدەیتە قاقای پێکەنین گوایە ئەو گوڵە لە داخدا شەق ئەبا و لێك ئەبێتەوە هەندێ ئەڵێن: گوایە گوڵەکە لە داخا وا ناکا بەڵکو هاوبەشی پێکەنینی بەرامبەرەکەی ئەکات و دەم ئەکاتەوە.

لێرەدا ئەوەتا تەنانەت گوڵ خەندەران کە هەمیشە دەم بە پێکەنینە ئەویش لە تاو شینی شێخ مەحموود پێکەنین و دەم کردنەوەی لا شوورەیی و نەنگە.

7–مۆڵە: بەسەر یە کدا کۆئەبنەوە.. کۆمەڵ بوون.

–کڕ و کش و مات: خامۆش و بێدەنگ.

–وڕە: کاسە، گێژە.

8–سەرچنار: هاوینە هەوارێکی جوان و دڵگیرە و دەستی سروشت ڕازاندوویەتەوە نزیکەی سێ کیلۆ مەتر لە شاری سولەیمانییەوە دوورە و کەوتۆتە ڕۆژئاوایەوە.

9–لوتکەی شیرین و هەڵگورد: مەبەست لە لوتکەی شاخی شیرین و لوتکەی شاخی حەسارۆستە.

–پەنگە: قەتیس، یان ڕاوەستاوە، پەنگی خواردۆتەوە، وەستاوە.

10–پشتکۆ: شاخی پشتکۆ نزیك دەماوەند، نزیك شاری کرمانشا.

–ئاراڕات: زنجیرە چیایەکە کەوتۆتە کوردستانی تورکیاوە.

–ئەزمڕ: زنجیرە چیای ئەزمڕ کەوتۆتە باکووری شاری سلێمانییەوە.

–کاژاو: مەبەست لە چیای کوڕەکاژاوە لە نزیك بەرزنجەی سەر بە شاری سولەیمانی.

11–بەلأم کوردستان با لە شینا بێ: واتە بە هۆی کۆچی دوایی شێخ مەحموودەوە هەرچەندە کوردستان شین و ماتە و پرسەیەتی بەلأم چاوەڕوانی جەنگی هوشیاربوونەوەیە.

12–سەراپا: سەرجەم، گشتی، هەمووی، کۆیی.

13–سیا بەرگ: بەرگی ڕەش، پۆشینی نیشانەی پرسە و ماتەمە.

–هەورامان: ناوچەی هەورامان سەر بە شاری سولەیمانی جێ داڵدەی شێخ مەحموود بوو بە تایبەت لە ساتی تەنگانەدا.

14–سۆراخی ڕاستی: شوێن پێ هەڵگرتنی ڕاستی، یا تەعقیبی ڕاستی کردن، مەبەست لە هەواڵی پرسینی وەفاتی شێخ مەحموودە.

–بەرانان: زنجیرە چیایەکە و لە باشووری شاری سولەیمانیدا ڕاکشاوە و بەسەر شارەکەدا ئەڕوانێ و گەڵێ گوندی خنجیلانە و جوان لە قەدپاڵەکانیایەتی، یەکێ لەو گوندانە گوندی (داری کەلی)یە کە مەڵبەندی حەوانەوەی شێخ مەحموود بوون.

15–دەخیل: هاوار و داد، زاراوەیە کە بۆ پەنا بردن و داڵدە بەکاردێت.

16–داری کـــەلی: گوندێکـــە کەتۆتـــە ڕۆژئـــاوای شـــاری سولەیمانییەوە و مەڵبەند و جێنشینی دوا تەمـەنی ژیـانی شـێخ مەحموود بوو.

17–کـانی ئاسـکان: گـەڕەکێکی کـۆن و بـەناوبانگی شـاری سولەیمانییە.

18–بـەردەقارەمان: تـاوێرە بـەردێکی گەورەیـە و کەوتۆتـە گەرووی دەربەندی بازیانەوە و لـە سەردەمی ڕاپەڕینەکانی شـێخ مەحمووددا شێخ قارەمانێتییەکی بە جەرگی تیا نواندووە و هـەر لەوێشـدا برینـدار کـرا و بـە دەسـتی نۆکـەرانی ئیمپریـالیزمی ئینگلیزی بەدیل گیرا.

–دەربـەند: دەربـەندی بازیانـە و کەوتۆتـە نێـوان شـەقامی سەرەکی کەرکوك و سولەیمانی.

–پیران: مەبەست لەو گوندەیە کە بەرامبەر کانی خـەیار نزیك دزڵی مەریوانە، دوا شـوێنی مەڵبـەندی شـێخ بـوو، دوای ئـەوەی دەست بەسەر کرا بۆ ناصریە.

19–ئاوباریك: گوندێکە لە گەرمیان، نزیك ناوچەی مەملەحەی لای کفرییەوە، شێخ مەحموود لەو گوندەیا شەڕێکی بەناوبانگی دژی ڕژێمی کۆنەپەرستی پاشایەتی عێراق کرد.

20–نەوەی ئەحمەدی کاکی: مەبەست شێخ مەحموودە کە لە نەوەی کاك ئەحمەدی شێخە.

21–تروفتـەی دەوران: تروفتـەی دەوران.. باڵندەیـەکی ڕاوکـەرە وەك بـازێکی بچـووك وایـە مەبەسـت لـە تروفتـەی دەوران، بـازی ڕاوکەری چەرخ و سەردەم.

–دەوران: چەرخ و زەمانە، ڕۆژگار.

–شەهێن: باڵندەیەکی گۆشتخۆری ئازایە و زۆربەی مەلـەکان لێی ئەسڵەمنەوە.

22–سەرنگون: سەرەوخوار، سەرەوژێر.

–حاڵمان ناحاڵە: ژیانمان نالەبار و پەشێو و ناخۆشە.

23–ئەکا گاڵە: حەشری پێ ئەکا، گاڵتەی پێ ئەکا.

24–بنوو لە باوەش دایکی دڵسۆزا: مەبەست لە کۆچی دوایی شـێخ مـەحموودە و تەسـلیم کردنییـەتی بـە خـاکی پـیرۆزی کوردستان.

25–بۆی بگێڕەوە ڕەنجوری کوردان:

ڕەنجوری: بیماری، نەخۆش و دەردەداری.

لێرەدا مەبەست لە ئازار و ژانی ژیانی مرۆڤی کوردە.

–پیشـانی بـدە برینـی گیـانت: مەبەسـت لـە برینـی گیـانت ئەوەیە. کە شێخ مەحموود دوو جار بە دەستی نۆکەری بێگانە و دوژمنی کـورد برینـدار کـرا، جـارێك لـە بـن بـەردە قارەمـانی لای دەربـەندی بازیـان و جـارێکیش لـەو سـاتەدا تـەرمی پـیرۆزی کـە هێنرایـەوە سـولەیمانی لـــە لایـەن کاربەدەســتانی ڕژێمـــی کۆنەپەرستی پاشایەتییەوە گولەباران کرا.

## طو اتيمالا[1]

پرشنگێکی درەوشەدار
پریسکی ئەڕوا شارە و شار[2]

بگاتە هەچ لوتکە و چۆڵێ
گەروویێ، چاوەیی دۆڵێ

گوڵێ سیس بووی گەرمای ستەم
ملی کەچی ژێرباری خەم

ئەیهێنێتە بریق و هووڕ
ئەیکا بە گەردنی بلوور..[3]

ئەو پرشنگە هەر چەندە وا
سەری هەڵدا لە ڕۆژئاوا[4]

بەڵام ڕووناکییەکەی هەرگیز
ناپرسێ هاوین و پاییز..!

لە ڕۆژئاوا تا ڕۆژهەڵات
ڕووناکییەکەی (تەم) لا ئەبات..!

گوێ ناداتە (ڕەگەز).. نەوە
سپی بێ ڕەش بێ.. هەر ئەوە[5]

گەلن.. گەلان ئەوەی ئەوێ
ژینی ئاسوودەی دەس کەوێ..!

چنگی چەوساننەوە و ئازار
ببڕێ، دەستی نالەبار

پەل کرێ.. تۆزی نەمێنێ
گەردی بە دوو چاو ببینێ[5]

ئەو پرشنگە گڕێکی سوور
ئەخاتە ناو ئاسمانی دوور

ئەنووسێ.. ئاشتی، ئازادی
گەشەی ڕزگاربوون و شادی..

گەیشتۆتە سەر وڵاتێ
بە ئاستەم دەنگی ئەگاتێ(6)

هەروەك گوڵی بەردی ناو ئاو
دەور پشتی هەموو تەنراو(7)

بە شەپۆل و دڕکی دڕ
بە زەلکاو و چقڵی چڕ..!

*   *   *

ئەو وڵاتە هەر چەن دوورە
بەڵام هێجگار پشت ئەستوورە

سا ئیمڕۆ بێ یاخۆ سبەی
کە چاوەی (ڕق) هاتەوە پەی(8)

لەبن هەر دارێ، بن بەردێ
لەسەر هەر هەردەیێ، وەردێ

گولآنی بە خوێن ئاودراو
ملانی بە دارا کراو

ئەو "پرشنگە" دێنەوە جۆش
ئەکەونە جۆشش و خرۆش

منیش لەم خاکە دیلەوە
بە دەم ئاوازی زیلەوە(9)

ئەڵێم نیشتمانی خەڵکی
خێر و بێر و فەڕ و کەڵکی

ئەبێ بۆ خەڵکەکانی بێ
بەری بۆ ڕەنجی شانی بێ

1–بە بۆنەی هێرشێکی ناڕەوای ئیمپریالیزمی ئەمریکا بۆ سەر گواتیمالا وتراوە کە میللەتی گواتیمالا بەربەرەکانییەکی پاڵەوانانەیان دژی ئیمپریالیزمی جیهانی کرد.

2–پریسکی: شەوقی، ڕووناکی، ئەڵێن پریسك و هووڕی ئەو ئاگرە، واتە شەوق و ڕووناکی ئەو ئاگرە.

3–بریق و هووڕ: شەوق و ڕووناکی و بریقەدانەوە.

4–ڕۆژئاوا: ئەو شوێنەی خۆری لێ ئاوا ئەبێت و ئیدی دنیا پەردەی تاریکی ئەپۆشێ، بەڵام لێرەدا بە واتای بیروڕای فیکری شۆڕشی فەڕەنسا دێت کە فەڕەنساش کەوتۆتە ڕۆژئاوا.

5–ڕەگەز: بنچینەی شوناسناسی نەتەوایەتی کەسانی نەتەوەیە وەك ئەڵێن: کورد ڕەگەزی ئاری و عەرەب لە ڕەگەزی سامی.

نەوە: مەبەست نەتەوە، گەل، میللەتە.

6–پەل کرێ: واتە لە ئەنجامی ستەم و زۆرکاریدا پەل پەل کرێ، یا هەر دوو دەست و هەر دوو قاچی ببڕێ و لێ بکرێتەوە.

7–گەیشتۆتە سەر وڵاتێ: مەبەست لە گواتیمالایە کە مەبەستەکانی شۆڕشی فەڕەنسای گەیشتویەتێ.

8–هەر وەگ گوڵی بەردی ناو ئاو: دیارە کە بەردێك لەناو ئاوێکدا بێت و گوڵێکی لەناو دەرچووبێ دیمەنێکی جوان و قەشەنگ ئەگەیەنێ کە ئەو گوڵە ئا لەو شوێنەدا ژیان و بوونی خۆی نیشان ئەدات گواتیمالاش بە خەبات و تێکۆشانی گوڵێکە و چواردەوری بە ستەم و ڕژێمی گەندەڵ سەر بە سەرمایەداری تەنراوە.

9–کە چاوی (ڕق) هاتەوە پەی:

10–منیش لەم خاکە دیلەوە: شاعیر کە ساڵی 1954 ئەم شیعرەی لە هاوبەشی تێکۆشانی گواتیمالادا وتووە. عێراق لەژێر چنگی نۆکەرانی بێگانەکانی ئیگلیزدا بوو بە تایبەت فەیسەڵ و عەبدوالە و نوری سەعید.

–بە دەم ئاوازی زیلەوە: زیل– سنجاب ئامێرێکی مۆسیقایە.



# من ئینسانم

1960

پێستم ڕەشە وەك شەوە زەنگ
لێوم ئەستوور لچم زەقە[1]
نیگام ماتە وەك گۆمی مەنگ
بزەم نەرم و سەرم ڕەقە
من ئێستاش لە هەندێ جێگا
ڕەشیم مایەی تێز و قێزە[2]
لەم کۆڵان بێ و لە ئەو ڕێگا
سپی لێم دوورە پەرێزە..!
بەڵام من ئیمڕۆ شێرانە
پێم لە زەوی گیر کردووە
ئەنەڕێنم دلێرانە
زراوی سپیم بردووە..
من لە کۆنگۆ یا لە کینیا
ئەڵێم وەك سپی ئینسانم
دەنگم چوو بۆ بنی دونیا
ئیتر خۆم خاوەن فەرمانم..!
من ڕەنگم زەرد و لووت پانم
ڕووم پڕ بوو لە لۆچ و چرچی
تفت و تاڵ بوو گوزەرانم
بەری ژینم هەر بە کرچی
دوژمن ئەی برد منی نەخۆش
جێی زۆربەم بەندیخانە بوو
دیلی ڕژێمی خۆفرۆش
بەشم توانج و تانە بوو..![7]
بەڵام ئیمڕۆ منی ڕەنگ زەرد
خۆم خاوەنی کار و بارم
سکم تێرە و دوورم لە دەرد
سەرفرازە لادێ و شارم..!
من بووم لە شەش یەکی جیهان
ئاواتم گرتە باوەشم
ڕەگی دوژمنم هەڵتەکان.
بە زەبری شۆڕ و شۆڕشم..!

منم لە "چین" من ئینسانم
من ڕێکخەری ژیانم
فێرکردنە تێکۆشانم
خۆم گەورەی نیشتمانم..!
منم بە تەنیا و بە تاکی
لێم قەدەغەیە و تاوانە
(دووان) بە وشەی زگماکی
ئەنجامی کۆت و زیندانە..!![8]
منم لە کوێ؟.. لە تورکیا
سەیر گۆڕاوە ناونیشانم
بە (من) ئەڵێن تورکی چیا
وەك ڕۆچووبێ کوردستانم..!
بەڵام.. منی کورد ئینسانم
وەکو تۆ ئەی برای ڕەشم
خاوەنی نرکە و هەستانم
هەرچەندە ئێستا دابەشم[9]
منیش وەکو تۆ ئینسانم
ئەی (کاکە) ئەی برای زەردم
دۆستی گەلانی جیهانم
ڕۆڵەی مەیدان و نەبەردم..!
سا ئیمڕۆ بێ یاخو سبەی
ئەگەمە سەودا و مەبەستم[10]
هەڵئەکێشم پشووی ئۆخەی
تێر لەو بایەی کە پێی مەستم



1–لچم زەقە: لچم دیار و دەرپەڕیوە، لچم ئەستورە.
2–قێز و بێز: نەویستن و نەفرەت لێکردن.
3–توانج و تانە: تیر و توانج، عەیب و تانە و لەکە دۆزینەوە.
4–دووان بە وشەی زکماکی: زمانی شیرینی کوردی.
5 –خاوەنی نرکە و هەستانم: خاوەنی دەنگ و ڕەنگی خۆمم و هەر ئەبێ ڕووبەڕووی دوژمن ببمەوە.
6–ئەگەمە سەودا و مەبەستم:
سەودا: لە کوردیا ئەوترێ سەودا سەر واتە ئەو هەواو ئارەزووەی لە کەللەدایە، یان ئەو عەشقە پیرۆزە.. لێرەدا بە واتای عەشق و خولیای سەر دێ کە هیوا و مەبەست ئەگرێتەوە.

سەرچاوە: دیوانی دیلان، ئامادەکردن و پێشەکیو پەراوێز بۆ نووسین: عەبدوڵلا عەزیز ئاگرین. چاپی 1987 لە بلاوکراوەکانی ئەمینداریەتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان.

**نمونەیەك لە چیرۆكەكانی**

# ئەو گوڵەم بدەرێ[1]

**1979**

دوو چاو، لە دوورەوە تێی ئەڕوانیم و نەئەترووکا، برژانگ سەرەوخوار نەئەکران دەم نووقابوو، گوێ نەئەدرایە بەرپێی چی لەبەر شەقاودا بێ، شانی لێ بدرایە، شانی بدا لە خەڵك، قۆڵی بەردەس بکەوتایە، دەستی بەر قۆڵ بکەوتایە ئەیڕوانی، تێر ئەیڕوانی، بێ گرێ، بێ تترووکاندن ئەیڕوانی، هاوڕێکەی کە لەگەڵمدا ورد پیاسەی ئەکرد، سەری لێ شێوا، لە پێشا ئەو سەرنجە ورد و درێژەی لا سەیر بوو، نەیئەزانی ئەگیرێتە کێ؟ ئاوڕی دوای خۆی دایەوە، یەکێکی وای نەبینی جێی ئەو سەرنجە بێ تەماشای بەردەمی خۆی کرد لە پێشەوە چەند کەسێکی ساکاری دی جێی ئەوە نەبوو ئەو سەرنجەی تێبگیرێ. سەرنجەکە تیژتر بوو، بێ گوێدانە خاوەن سەرنج ورد بێ تترووکاندنی چاو هات، هات پێش ئەوەی بگاتە ڕاستم قووڵتر ڕوانییە هەردوو چاوم، کە خەریکبوو بگاتە لاشانم، دڵۆپێکی گەورەی بڵاوبووەوە بەناوچاوەکانیا ئەم سەروئەوسەری چاو، گێژ و کەژاڵە پاکە پڕ لە بەزەییەی گرتەوە، کە لێم تێپەڕ بوو، پاش ڕۆشتنێکی بێئاگایی لە خۆم و لەوەی لەگەڵمایە و لەوەی لەبەردەممایە. هاوڕێکەم وتی: ئەرێ ئەوە کێ بوو؟ وردەیەك هاتمەوە هۆش خۆم، هاوڕێکەم، با زوو بگەینە دەرمانخانەکەی ئەوبەر پشوویەك بدە و تێم بگەیەنە!. تێم گەێنە تۆی چاو هەڵگلۆفراوی کز بینین و مل و



شان بارکێشی مەینەتی دوور و درێژ زۆربەی ساڵانی لاویت لەناو دیواردا ڕابوارد و، ڕیشەکێشی نەبوونی، هەندێ جار هەموو کەسێ نزیکت و کەسوکارت هەندێ جار زۆربە لێت دوورەپەرێز، تۆی چەقی ئاوەسوو پەراسوو، پەراسوو شکاو، ڕووت، پێ هەڵخلیسکاو، نەك جارێ، چەن جارێ هیچ بە هیچ نەکردوو، لە بارەی سامانی دنیاوە، هیچ بۆ خۆنەکردوو لە بارەی دنیای ئەولاوە، تۆی تەزیوی ساردی ژیان، ڕەهەندەی کۆسپ و چیاو ئاوی سوور و سوێری ئەم وڵاتە، تۆی زەرد هەندێ جار، ڕەش هەندێ جار، لە بەرچاوی خەڵك، تۆی گەورە، زیرەك، خوێندەوار، ڕۆشنبیر، لە کاتی نەختێ سەرگەرم بونا، تۆی هیچ، هیچ، هیچ، لە کاتی هیچی ئەوانا، تێم گەێنە، تکات لێ ئەکەم تێنم گەێنە تۆو سەرنجی قووڵی چاوێکی پڕ لە فرمێسکی کەژاڵیی، کراوەی بێ درۆی بێ هەڵخەڵەتاندنی خۆ بە گوناهکار و گوناهبارتر زانیو بەرامبەرت. تێم گەێنە، لەم شەقامە پانەدا، لەناو ئەم هەموو خەڵکە جۆربەجۆرەدا تۆی لەرزۆکی ژیانی جووڵە و بزووتن، بێ هەناوی باوەش کردنەوە، بێ دەنگی ڕێگاگر بەرەو لە گۆکەوتن، تۆی کەنارگر، لا، دووری تێکەڵاوی، پڕوکاوی تەکانی گەرمای سەرکەوتن. پێ لە خرتکە چووی سەربەرەو خواری، نیشان لێ دیار نەبووی پانی و بەرینی. تێم گەێنە ئەو دوو لێوە نووقاوە دوور لە پشکوتنەی نەفرەت لە ژیان کەرەی تا تۆ نەدیو. لە هەموو شتێ هەڵقورتاو، تا ئەو

سەروچاوە ژاکاوە تەپیوە نەدیو، چی بوو؟ ڕاست بوو؟ بە ڕاستی بوو؟ تۆی مەبەست بوو؟ تۆی گرتەوە؟ تۆی باربوو کرد؟ چی بوو، تکات لێ ئەکەم تێم گەێنە چییە؟ وتم، ورد گوێ ڕاگرە، بە مەرجێ تا لێنەبمەوە هیچ پێم نەبڕی، نەپرسیاری ئەی بۆچی واو ئەوە بۆ وام لێ نەکەی! ڕام مەکێشە بۆ هیچ پرسیارێك، بۆ وای نەکرد بۆ وات نەکرد، بۆ وایان نەکرد؟ گوێ ڕاگرە، وتی فەرموو:

سالْ بەهارە، گەرمەی گەشانەوەیە، چوالە گوڵی سووراو کراوە، گۆیژە، قەیفەیەکی سەوزی پۆشیوە، بنار زەردی گوڵە بەیبوون و نێرگسە دەغل نوقمی خەرتەلەی زەردە گردۆڵکەکان، سووری گوڵاڵەن، چرۆی ئەرخەوانی تازەپشکوتوو تازە کراوە، ڕاکێشەری هەزارەها هەنگی لێوڕوکاوە، بەرەو خوار بڕوانێت، بەرەو تانجەرۆ تا چاو بڕکات سەوزە، هەموو شتێ پێئەکەنێ، ئاسمان شینە، تاکە تاکە پەڵەهەورێکی سپی سەر دارمازەڵە و پیرەمەگروونی گرتووە. هەوری سەر قەیوان تۆخ دڵی پارە دیارە، وردە وردە لەسەرخۆ لە مالْ هاتمە دەرەوە. ئەوسا سەرم ڕەش بوو، چاوم کراوە و بریقەدار بوو، ڕۆینم بە پای ئارەزوو بوو، دڵم کراوەی لاوی بوو، تەنم گوڕی لێ هەڵئەقولا، ماوەی چەند ساڵێ بوو هەوڵم دابوو بنجێ گوڵی گوڵە باخی ئاڵم دەست کەوتبوو ڕوانیبووم یەکەم خونچەی کە کرایەوە پچڕیم و گرتم بە دەستەوە، پێویست بە درێژە ناکات لەسەرخۆ بە پەنجەکانی دەستی چەپم ئەمدیو ئەودیوم پێ ئەکرد، تەماشای جوانی گوڵەکەم ئەکرد، لەپڕ، بەڵی لەپڕ، دەنگێکی سەیری خۆشی تەزوو بە لەشاهێنەر، دەمار ڕاچڵەکێنەری فریشتەیی وتی (ئەو گوڵەم بدەرێ) کە تێم ڕوانی چی ببینم، لەدەست و پەنجەوە ئەو دیوی دیار، ڕووناکی فڕێدەر خڕوخەپان، ئەمویست درێژ لەسەرخۆ ڕوانینم بەرەو ژوورتر برد، دوبارە ڕوانینم گێڕایەوە بۆ تێر تەماشاکردنی، ئەمەوێ لە سەیری ئەو دەست و پەنجانە تێربم، هەتا دێت جوانتر و گەشەدارتر و مەشخەڵ فڕێ دەرتر ئەنوێنێ تەماشاکردنم بە پەلە لە گرێی پەنجەکانەوە سەرخست بۆ ژوورتر، ژێر چەناگە، ترنجێکی بێ گرێی کۆڵ ژێر لێو نەختێ چالْ، دەم، چی بڵێم، خونچەی گوڵە هەنارێکی بە ئاستەم درز تێبوو، لووت گوڵێکی ڕێکەوتوو لەگەڵ دەمە نووقاوە هەزار داستان لێ دروست کراوەکەیدا، ئینجا بۆ لەناو دەریای مەنگی کەژالْ. چە چاوێ، هەموو گێتی لەناویا تواوە، هەموو چیاکانی دەوروپشت ڕەنگ لێنیشتوو، پرچ ئالۆزێکی کەمێ گرژ، برۆ جووت دەستکاری نەکراو ڕێك نەخراو، کەم و زۆر نەکراو، بە کورتی وشك بوم، دەستە لەرزۆکەکەمم لەسەرخۆ بۆ هەڵبڕی، گوڵە پچڕێنراوەکەی کە بریتی بوو لە دڵۆپی خوێنم نەخشێنراو دامە دەستی، گیان و هەست و هەناسەم هەموو شتێکم پێوەدایە ئەو پەنجە هەموو دنیا هێنەرەی لای هەتا ئێستام. بە لێوە خوێن تێزاوەکەی فەرمووی، سوپاس، تا دەرگاکەی پێوەدا سێ چوار جار ئاوڕی لێ دامەوە وشك وەستا و خەڵك دێت و دەڕوات و ئەمبینێ. ئەو ئاوڕم لێ ئەداتەوە. ئەوەی تریان تریسکە ئەبەستێ، جووت ئەبن و ئەوانیش تێکەڵ ئەم گێژە هەموو ئەندام هێنەرە هەڵپەڕکێیە ئەبن، نازانم، نازانم. چەن دەقیقەیەك، چەن ساتێك تێپەڕبوو چی بکەم بگەڕێمەوە، بۆ دووبارەکردنەوەی سەرلەنوێ ڕێگای ئەوبەر دەرگا گرتنەم، نەگەڕێمەوە، ئارامم نییە، پرسیارم لێ ئەکەن نازانم ئەڵێن چی!! نازانن چی وەڵام ئەدەمەوە، هەموو شتێکم لا ون بوو، بەهاری چی؟ پەڵەی گوڵاڵەی سووری چی! فەرشی سەوزەگیای کەناری چی؟ خوێندنی هۆزار و مەلە دەنگخۆشەکان، هەموو شتێ (بەهارە جوانیی بەهار، دەنگخۆشی، سامان، بۆ ئەو یەك شت نەبێ) یەك شت نەبێ، نیشتمان، ئەم وشەیە نیشتمان لە پێشا ڕای چڵەکاندم، لە پاشا ورد ورد وەستاندمی، هەڵسلەمیمەوە، خۆم بە خۆم گوت، بڵێی وەك من وشەی نیشتمان لەوپەڕی ئاسۆی بەرزی ئاوات و ئارەزووەوە سووکێ هێنامییەوە، ئەویش هەر هیچ نەبێ کەمەکێ وشەی نیشتمان، کاری تێکردبێ!! وەك چۆن وشەی نیشتمان هێنامیەوە، پێی وتم، وەرەوە، وەرەوە، وەرەوە، لەپڕ، بیری کەوتبێتەوە، خۆی سڵەماندبێتەوە، باشتر وایە خۆم تاقی کەمەوە بڕیارم دا نووسراوێکی بچووکی بۆ بنووسم و بۆی بنێرم، چی ئەبێ، خۆ دنیا ژێر و زەبەر نابێ، خۆ هیچ نەبێ لە دەروونی ئەویش ئەگەم و نووسیم! خۆشەویستم نازانم چۆن دەس پێ بکەم، بە پرس، بە تکا، بە پاڕانەوە بە لالانەوە بە کڕنوش، بە لەرزۆکی یا وەکو کوردێك باشتر وایە وەکو ڕۆڵەیەکی ئەم نیشتمانە خێرلەخۆ نەدیوە، خوێن پیاهەڵپژاوە، دەم تێژەنراوە، کوت کراوە، کە چەند سەدەیەکە خەڵکەکەی تێ هەڵئەچێ ڕائەپەڕێ، پەنگ ئەخواتەوە، تەکان ئەدا، سەروچاوی تەپ و دوکەڵاوی ئەبێ خوێن بە هەموو پەل و هەنگاوێکیا دێتە خوارەوە و ئەگاتە ئەوەی بڵێ (ئۆخەی) لە پڕ دەستەئەژنۆ، پەراسوو تێکشکاو، لانە لێشێواو، پەرەوازە و تاکو لۆ ناوچەوان لۆچاوی، نینۆك هەڵکێشراو، یەخە دادڕاو پێ لە خرتکە چوو، لەڕ، لاواز، بێتین، لاکە لەسەر و هەموو ئەندامییەوە هاتوو، شپرزە، تاڵاوچێژ، کەمەر تێ سرەوێنراو ڕووە و ڕۆژی لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵهاتوو، چاوە نەرمە خەوی شەو بێداری تێشکاوەکەی نەرم ئەترووکێنێ، لەژێر لێوەوە، ئەڵی ئەم جارەش خەو بوو بەڵێ، ئەم جارەش خەو بوو وەکو جارەکانی تر، بەلام ئەی خۆشەویستم ئاوات خۆی



چییە؟ هەناسە هەڵکێشانە و بەس کە نەهاتە دی؟ نەخۆش کەوتنێکە و مردن کە نەهاتە دی! یا دووبارە خۆگرتنەوەیە، خۆ خەریککردنەوەیە، خۆ هاوێشتنە کۆڕەووەیە بۆ تین پەیداکردن و جموجوڵ بۆ لە هەتاوی مانگی نیسانی بەهار گەیاندن کە پێست پێویستی بەهەتاوە. بۆ پنگر بونەوە و ئەستوور بوون بۆ ئەوەی چنگ و نینۆك كار تێنەكراوتر بێ، تکات لێ ئەکەم، وەڵامێکی دەسوبردم بدەرەوە! یەکەم: وتەکان ئەسەلمێنێ یان نا؟ دووەم: یەکترمان خۆش ئەوێ یان نا؟ چاوەڕێی وەڵامم. چەند ڕۆژێکی بەسەردا تێپەڕیبوو، وەڵامم وەرنەگرتەوە، دەستم کرد بە هاتوچۆ، بە خێرایی ڕۆیشتن، لەپڕ ڕۆیشتن خاوکردنەوە، سەراسیمە لەم سووچ و لەو سەرەڕێ لەو کۆڵان، نەبوو، نەبوو، خۆمم بە خۆمم وت بڵێی نووسراوەکەم دەس کەس کەوتبێ، نەیگەیێنێ کەسوکارێکی پێی زانیبێ! لە پاشا خۆم وەڵامی خۆمم ئەدایەوە، یا دیبێتیان، خۆ کفرم نەکردووە، خۆ هەڵەم نەکردووە، خۆ قسەی بێ جێم نەکردووە. خۆ قسەی توێکڵ دارم نەکردووە. چیم وتووە ڕاستەو ئامادەم دووبارەی کەمەوە، ئارامم لێ بڕا، خواردنم کەمی کرد، لۆچی خەفەت کەوتە ڕووم، زەردی شێوەی دەموچاومی گرت، بڵێی بە هەڵە نەچووبم، بڵێی (ئەو گوڵەم بدەرێ)یەی ئەو هەر شتێکی ساکاری ڕێکەوت بووبێ، دووبارە وەڵامم ئەدایەوە، خۆم ئەموت، بۆچی چاو ئەخوێنرێتەوە یا ئەندامی تر؟! من ئەزانم چاوی وتی چی و چیش ئەڵێ، با دووبارە خۆم تاقی بکەمەوە و نووسیم:

خۆشەویستم، ماوەیەکی کەم ڕۆیی بەسەر نووسراوی یەکەممدا، بە ماوە، بەڵام بەلای منەوە تەمەنێکە، نازانم ئایا نامەی پێش ئەمەت بەدەست کەوتووە یان نا؟ پێش ئەوەی دەس تۆ بکەوێ دەس کەسی تر کەوتووە یان نا؟ ئەگەر لەو باوەڕەدای وەڵامدانەوەت وا نابێ وەکو من مەبەستمە، وەکو من بە تەمام، وەکو من گیرۆدەم، ئەوە هی خۆتە، خۆ گەر وای لێك ئەدەیتەوە كە نووسراوەکەت بیگرێتە شووشە و هەڵواسرێ وەکو وێنەیەکی ژیانم کە ڕتووش و دەسکاری نەکرابێ، ئەوەش هەر هی خۆتە ئەگەر وای لێك ئەدەیتەوە وەڵامەکەت ناچارم بکا چاو بگەیەنم بە دەس، دەس بگەیەنم بە یەك و دڵۆپی فرمێسکی دەس بە یەك گەیشتن لە هەردوو چاومان بێتە خوارەوە و زەویی بەردەمی ژیانمانی پێ بنەخشێ، بۆچی وەڵامم نادەیتەوە؟ چونکە با پێت بڵێم ئەوەی کە لە نووسراوی پێشوودا بۆم نووسیت دووبارەی ئەکەمەوە من (کوردم)، یەکێکم لە ئازارچێشتووەکانی ئەم شارە شیرینە، شێوە بەهاری جوان، وەرزی وڵاتەکەم، ئەوەندە تێگەیەنە خۆ نووسراوی یەکەمت پێگەیشتووە یان نا؟ سوپاس. هەمدیسان کەوتمەوە سەرهێنان و سەربردن، هەمدیسان کەوتمەوە هاتوچۆی ناو ژوور، وەرە چی بکەم، چی نەکەم؟

بڵێی نووسراوەکەمی وەرگرتبێ؟ وەڵامی دابێتەوە و بە یەکێکا ناردبێتی و نەگەیشتبێتە دەس من؟ بڵێی؟ نەنووسراوی نووسیبێ و نووسراوەکەی منیشی دڕیبێ؟ بڵێی لە ترسا لە ناوی بردبێ لە تاو دەوروپشتی، ئەی بڵێی ئەمە هەمووی لێکدانەوە و پەشێوی و بێئاگایی و بێدەرفەت چاوەڕوانی خۆم بێ خۆم و ڕووت؟ چی بکەم؟ بۆ کوێ بچم؟ خۆم لەبەر خۆمەوە ئەم وت: بنووسەرەوە، نووسراوێکی تر، بنووسە، بنووسە، سێ بارە نووسیم. خۆشەویستەکەم، ئارام لەبەر بڕەکەم، مێشك و بیر تێکدەرەکەم، خەولێهەساران خۆشەویستەکەم، خۆراك لێتاڵکەرەکەم، یەك شت ماوە لێم تێکدەی، لێم بگری ئەویش هەوایە، یاخود هەناسەوەرگرتنە! ئەگەر بێت و تێنەگەم ئەو دوو نووسراوەی کەیەك لە دوای یەك بۆم نووسیت، پێت گەییووە یان نا؟ بەرچاوت کەوتووە یان نا؟ خوێندووتەوە یان نا؟ ئەوا ئاسمانی ژیانی لێ ورووژاوم ڕەش هەڵئەگیرسێنێ، تکام وایە، سێ بارە تکام وایە تێم بگەیەنی، نووسراوەکانم، سووتێنراوە! پارچە پارچە کراوە خراوەتە ژێر گڵەوە؟ شاردراوتەوە؟ چییان لێ هاتووە؟ هەمدیسان تکات لێ ئەکەم تێم بگەیەنە، خۆ ئەگەر.. خەریك بووم وشەی دوایی خۆ ئەگەر بنووسم لە دەرگای حەوشێ

دڕا! چوونە ناو کاغەز نووسینەکە وای لێکردبووم زۆر گوێ نەدەمە لە دەرگادان، خەریك بووم بنووسم و دووبارە لە دەرگا دڕا، کاغەز و پێنووسم واز لێهێنا، سووکێ هەستام، وردە وردە ڕۆیشتم بەرەو دەرگاکردنەوە دەستم دایە دەرگا و کردمەوە و خستمە سەرپشت چیم دی؟ ئافرەتێکی خۆپێچەرەوە بە عەبا و پەچەیەکی ئەوتۆوە کە بە هیچ جۆرێ شێوەی دەم و چاوی ژێر پەچەی دیار نەبوو، سەرم سووڕما وتم، فەرموو، چیت ئەوێ؟ ماڵی کێت ئەوێ؟ بێئەوەی سرپەی لێوە بێ سووك خۆی کرد بە ژوورا، بۆ حەوشە، بە دوو سێ هەنگاو ڕووی کردە ئەو ژوورەی کە نووسراوی سێهەمم لێ ئەنووسی. نەختێ لە هەیوانی بەردەمی ژوورەکەدا خۆم لێ خلافان و لە دڵی خۆما وتم، کێ بێ؟ چی بوێ؟ بۆچی هاتبێ؟ چۆن وا بێ ورتەلێوەهاتن خۆی کرد بە ژوورا و یەکسەر بۆ ژووری کاغەزلێنووسینەکە، نەختێکی تر وەستام و لەسەر خۆ چووم بەرامبەری دانیشتم. سەرم هەڵبڕی وتم، خۆشهاتی، وەڵام نەبوو، دووبارە وتمەوە بەخێربێی، سووکێ لێوێکی لەرزۆکی بزوان، بە ئاستەم هاتە گوێم وتی: سوپاس! ئەم دەنگە سەیرە! تۆزێ چاوم بڕیە بەردەمی خۆم، دووبارە سەرم هەڵبڕییەوە، وتم، فەرموو. فەرمانت چییە؟ بۆچی هاتووی؟ هەمدیسان نەختێ وەستام و وەڵام نەبوو! نەبوو، ئەوەندەی تر سەرم سوڕما، سووکێ دەستم برد بۆ کاغەز و پێنووسەکە، بەدەست و پەنجەیەکی کارتێکراوەوە ڕێکم خستن، لاپەڕەکانم ڕێکخستەوە و ڕووم کردە نیگارە ڕەشەکەی بەرامبەرم لە تەپڵی سەریەوە لەسەرخۆ دەستم کرد بە تەماشاکردنی بۆ دەموچاوی ژێر پەچە و بۆ سنگ و بەرۆکی داخراو و تا نووکی پێی هیچ شتێکی ئەوتۆم دەس نەکەوت کە بەڵگە بێ بۆ نەختێ ناسین! ماوەیەك تەماشاکردنی ئەم دیمەنە ڕەشە، سەیرە، ئەم ئەندامە خۆپێچراوانەم کرد بێئەوەی بتوانم لە هیچ بگەم، دەستم برد بۆ گوێچکەکەم، لەبەرخۆمەوە وتم، باشتر وایە بچم دەرگای حەوشەکە دابخەم نەك لە ناکاو یەکێ، کەسوکارێ، برادەرێ خۆی بکا بە ژوورا بێ ئاگا لێبوونم و ڕاست بێتە ئەم ژوورە، تەکانم دایە خۆم هەڵسم، ڕەشپۆشی بەرامبەرم، وتی، مەچۆ، دەنگێکی سەیرتر، وشك بووم و ئەڕوانمە ئەم دیمەنە سەیرە، چاو ناتروکێنم، دەس نابزوێنم ورتەم لێوە نایەت، کەوتمە دەریایەکی سەیرەوە، ڕاستت ئەوێ نەمئەزانی چی بکەم، چاوم داخستەوە، دووبارە ڕوانیمە بەرپێی هەردووکمان، خشپەی شتێ سووك هاتە بەرگوێم، وردێ سەرم هەڵبڕی، چیم بەرچاو بکەوێ؟ یەکەم جار؟! چی ببینم؟ یەك دوو پەنجەم دی خەریك بوو پەچەکەی تەوا لە دەموچاو لائەدا.

نەختێکی تر وێرام سەیرتر کەم، لێو و دەمێکم دی، لێدانی دڵ گەیشتە سەر سەد! زووتر پێڵووم بەرزتر کردەوە دوو چاوم دی، هەموو ئەندامم بەڵێ هەموو ئەندامم هاتە جووڵە و پێستم دەستی کرد بە زەردهەڵگەڕان خەریك بووم پڕ بە دەم و قوڕگ هاوار کەم، زانی خەریکم، نەختێ لە جێی خۆی جووڵا و چارشێوە و عەباکەی لە خۆی کردەوە و گرمۆڵەی کرد و خستییە سەر کورسییەکەی تەنیشت خۆی و وتی: دو سێ ڕۆژە لە لێکدانەوەدام کە وەڵامی نووسراوەکانت بدەمەوە. یان نا؟! خۆم بیهێنم و بیدەمە دەستت، ئەویشم لا پەسەن نەبوو، ئەم دوو سێ ڕۆژە سەرهێنان و سەربردنە وای لێ کردم و بڕیاری تەواوم دا خۆم بێم و چی لە دڵمایە بۆتی هەڵڕێژم. وتەکانی لەو دوو لێوە یاقووتییە ئەباری هەموو ئەندامی ئەو کردبوو بە گوڵ، هەموو ئەندامی منیشی کردبوو بە گوێ! بەڵێ هەموو ڕەگ و دەمار و خوێنم گوێ بوو بێئەوەی بە خوێن وتەکانی هەڵمژم نەك بە هەناسە تێکەڵ بێ بە گیانم بۆئەوەی ئەگەر هات و لە بەرچاویشم ون بوو وتەکانی لە هەموو ئەندامەکانما بمێنێتەوە و تین بدات بە ساڵەهای ژیانی لەوە دوام، لەوە پاشم، وتم باشە ئەی ماوەیەکە زیاترە لە چەن ڕۆژێ هۆی نەهاتنت وەکو ئێستا هاتی چی بوو؟ وتی: وەکو کەوتبوویتە گۆمەوە کە لە نووسراوەکانتا بەدی ئەکرا منیش هەموو هەست و نەستم لای خۆم نەمابوو، منیش وەکو خۆم لەگەڵ خۆما.. ڕاوێژکەر بووم، درێژە نەدەمێ، کە من تۆ بە خۆەویشتی ڕاستەقینەی لە دڵەوە هەڵقوڵاوی خۆم ئەزانم، پێویست ناکا لەسەری بڕۆی، با ئیتر درێژەی نەدەینێ، چیت ئامادە کردووە بۆ ئەمجارە چونکە ئەو چەن پارچانەی کە لە ڕۆژنامەی (..) خوێندمەوە شتێکی لێ تێگەیشتم کە هەڵبەست و نووسینەکانت دوو جۆرە مانای هەیە.

یەکێکیان (نیشتمان) و خۆشەویستکردنی نیشتمان، دووەمیان مەبەستت (منە)، هەر چەندە هەموو خوێندەوارێك وەکو من لێکی ناداتەوە، هەر سادە و ڕووت بۆی ئەڕۆن بەڵام من لای دووەمیش لێك ئەدەمەوە، ئەزانم ئەڵێی چی!! لە مەبەستت ئەگەم و ئەشخوازم درێژە بە نووسین و هەڵبەستەکانت بدەیت چونکو مەبەستی دووەمیشیان هەر گەشەپێدانی زمان و نووسینی کوردییە ئەو چەن ساتەی پێکەوە دانیشتین، بە ڕاستی نازانم چەن بوو، بەڵام بەلای منەوە وەکو چەن دەقیقەیەك وابوو، ئاواتەخواز بووم ڕۆژی ئەو ڕۆژە زۆر درێژتر بوایە، ئەوەندەی پێ نەچوو وتی، درەنگە با بڕۆم، ئیمڕۆ بەسە تا چەند ڕۆژێکی تر بە یەك ئەگەینەوە، تا دەرگای حەوشێ لەگەڵیا چووم دەستم خستە ناودەستی، کە مەگەر خۆم و خۆی بزانین ئەو دەستخستنە ناودەستە

چی گەیان. بڕوات وابێ کاکی برا ئێستاش گەرمیی نازکیی، نەرمی، کارەبای دەست و پەنجەکانی لە گیانما هەر گەشە ئەکا، ناڕواتە دەرێ تا ژێر گڵ خۆشەویستیی ڕاستەقینەی بێ گرێ و نزیك و دوور، ڕۆژ، مانگ بە مانگ لە بڵێسە سەندندابوو، خۆشەویستی ئێمەی بێ گرێ، بێگرێی شارێکی وەکو ئەم شارە بە قسەیە، بە توانەی هەندێ، بە زرمە لێهەڵساندنەی تاقمێ، بە پارە پەرتسنەوەی دەستەیە، بە شەرەف و دڵسووتاو و ڕاست و ڕاسترۆیی زۆربەی، بەڵی خۆشەوستی دڵ و گیان بیر و لێکدانەوە و هەنگاوی پڕ لە تێکۆشان بۆ چارەسەرکردنی نەتەوە نەمردووە، ڕیشەکێش نەکراوە، جیڕ و هەڵمەت بەرەکەمان لە کونجێکی وڵاتەکەیەوە دامالراو لە لایەکی ترەوە دووبارەکردنەوەی کۆشش بۆ گەیینە ئامانجە پیرۆزەکانی، خۆشەویستیمان تا ئەهات بەرەو گەشەسەندنو داچەسپاندن ئەڕۆیشت. چەن جارێ یەکتریمان تاقی کردەوە، دوا بڕیار هاتینە سەرئەوەی ڕێگا خۆشکەین بۆ ئاشکراکردن پاش هەڵسەنگاندنێکی تەواو، بۆ بوون بە هاوبەشی ژیان. لە یەکتری بینینەوەکاندا گەیشتینە ئەو بڕیارە کە ئەگەر تەگەرە و گرێیەکیش بێتە ڕێ گوێ نەدەینێ و بەسەریا بازبدەین. شەوی نەورۆزی ساڵی تێپەڕبووەمان دانا بۆ خوازبێنی ئاشکرا.

ئێوارێی ئاگری نەورۆزکردنەوە، ڕوانیمە چیاکان لە هەموو لووتکەیەکەوە کڵپە و بڵێسەی ئاگری بوو، ڕووم کردە ڕۆژهەڵات، ڕوانیمە زەردەی ژوور کەل، ڕووم کردە ڕۆژئاوا بوون، لە تەمەنمدا وەهام نەدیبوو، بریتی بوو لە کۆمەڵە پشکۆیەکی یاقووتی شێوە، سەیرم هاتە بەرچاو کۆمەڵە ئاگرێکی سوور، بەرامبەری وەستام، ڕۆژ لە ئاوابوونا و منیش ڕاچڵەکیم لە دڵی خۆما وتم، شەوێ خوازبێنی نەورۆز، ڕۆژ پشکۆیەکی درەوشەداری خوێن لێباریو. لە ئاوابوونا سوور. ڕۆژ ئاوابوو و نەبوو، دەورووپشتی ماڵەوەکان جووڵەیەکی شێوە سامناکی سەیری تێکەوت خەڵکی ناسیا و نەناسیاو تیژ خێرا ئەڕۆن و خۆیان ئەگەیەننە ماڵەوە لەلام سەیر بوو، پێش ئەوەی بگەمە ماڵ و دەرکی ماڵەوە بکەمەوە و دەستم برد بۆ دەرگا، یەکێ لە دواوە وتی، بوەستە، دەنگەکە سەیر بوو لام، وەستام سووك ئاوڕم دایەوە. یەك دوو، سێ، چوار، پێنج زیاتر لە دە ژاندارمم دی بە چەکەوە و یەکێ لە پێشیانەوە وتیان گوێت لێیە لەگەڵ یەك دووانێکیا بوەستە و سەرکەوتنە سەربان و دەستیان کرد بە پشکنینی ماڵ، ئەم ژوور ئەو ژوور، ئەم پەنا ئەو قوژبن، ماوەیەکی خایان وتیان پێشمان کەوە، وتم بۆ کوێ؟! وتیان ورتەت لێوە نەیەت تۆ گیرایت. ئەو شەوەم چۆن لێ ڕۆی، نازانم چی بنووسم، نازانم چی بڵێم، لە خوازبێنی کردنی ئاشکرا و گەشانەوە و شیرینی دابەشکردنی خێزانی و خۆیەتییەوە بۆ ژووری زیندان، لە شەوی ئاگر لەسەر هەموو بەرزییەکی شاخەکانی دەوروپشتەوە بۆ ژێر زنجیر لەناو پەڵەیە نێرگسەوە بۆ ژووری درك، لە پشکوتنی بەهارەوە بۆ چاڵی هەتاو لێ شاردنەوە، لە پەنجە لەناو پەنجە خستنی ژیانییەوە بەهاروە بۆ چاڵی هەتاو لێشاردنەوە، لە پەنجە لەناو پەنجەخستنی ژیانییەوە بۆ دەستگرتن بە شیشی ئاسنی دەرگاکانەوە. لە بیرکردنەوەیەکی هەموو سووچێکی ژیان لێ گەشاوە بۆ پێش خواردنەوەیەکی بێ سنوور، ئەو شەوەم نازانم چۆن لێ ڕۆیی، ئەوەندەم دێتەوە یاد کە خەوی پچڕپچڕ و لە خەو ڕاپەڕین نە جارێ نە دوو فیکە لە خەو ڕاپەڕاندن و تل و ئەمدیو و ئەودیو کردن، سەرت نەیەشێنم شەو بۆ ڕۆژ، ڕۆژ بۆ شەو و بۆ هەفتە و بۆ مانگ.

ڕۆژێکی خۆشە، هەتاوە و لە کاتی دەی بەیانییەوە کەسوکار بینینە. لەگەڵ هاوڕێکانمانا، خۆمان ئامادەکرد و لە ژوور چووینە دەرێ ڕووە و حەوشە گەورەکەی زیندان کشاین، پەنا دیوارێکم لەوپەڕی دوور لە خەڵکەوە گرت و دەستەئەژنۆ دەستم کرد بە چاوی گێڕان. بڵێی بێت، ببینم، بڵێی چاوم پێ بکەوێ، کەوتبوومە گۆمی لێکدانەوە. هوروژمی چاوپێکەوتنی کەسوکار و ناسیاو و دۆست حەوشە پڕبوو، دیار نەبوو، کەوتمە گفتوگۆ لەگەڵ کەسوکاردا، فلان چۆنە؟ فیسار لە چیایە؟ ئەوەی هاتبوو بۆ لام سەری هێنامە پێشێ، وتی ئێستە دێ، بڕوات هەبێ ڕەنگم هێنا و ڕەنگم برد، گەشامەوە، سووری ڕووی کردە شێوەم بزە کەوتە لێوم ڕووە و دەرگا ڕوانیم دیم لەگەڵ یەکێ لە دەستە خوشکەکانی کشا، هات پێش ئەوەی بگاتە ڕاستم چۆنت دی ماوەیە لەمەوبەر لەوبەرەوە کە تووشمان هات فرمێسك گەیشتبووە سەر هەردوو گۆنای، هەستام گرتم دەستم گوشی، گوتم، ئۆخەی ڕەوانەکرام، دیمیتەوە، دانیشتین جارێ بە دڵخۆشی دانەوە، جارێ هەناسە هەڵکێشان، جارێ بە خۆ جیرکردنەوە، جارێ بە خۆ هاویشتنە ناو دەریای ڕێکەوتەوە و دوا دەس گوشینمان بەم وشانە لە یەکترازان، ژیان بۆ نەتەوەکەمان. گەڕاینەوە ژوورێ، ڕاست لەسەر جێگاکەم لێی کەوتم لەپەو ڕوو، هاوڕێ گیراوەکەی تەنیشتم وتی کاکە، کاکە، هەڵناسی؟! خۆ تۆ نانی نیوەڕۆت نەخواردووە، بە ئاستەم بزووتم و ڕاست بوومەوە، هاوڕێکەم وتی، دەموچاوت تەواو نییە، دەستی هێنا بۆ دەستم، وتی، بەخوا کەمێ گەرمی، ئەوەندەم ئاگا لە خۆم بوو، کاتێ چاوم کردەوە لە خەستەخانەی تایبەتی بە زیندان کەوتووم، شکی گرانەتام لێ ئەکرێ، نازانم ئەو چەن ڕۆژە خەستەخانەیەم چۆن لێ

ڕۆیی، کە گێڕامیانەوە بۆ زیندان پاش پانزە ڕۆژ بوو بووم بە پێستێکی لەسەر ئێسک، زەرد گێژ، لەش داماڵراو چاو بە قووڵاچوو، هارە لە کەلەی سەرمەوە ئەهات، هیچم پێ نەخورا، چاوم ڕەشکەوپێشکەی ئەکرد، وردە وردە پارێز و دەرمان و دەرزی، نەختێ خۆم گرتەوە.

شەوێك زوو خەوم لێ کەوت، قووڵ چوومە ناو خەوەکەوە، لە دنگی گرمە و دەنگە دەنگ و هەرا ڕاپەڕیم، وتم چییە؟ وتیان خۆت کۆکەرەوە. بۆ؟ ڕەوانە ئەکرێن. بە پەلە سا هەرچۆنێ بوو خۆمان کۆکردەوە و دەموچاو تەڕکرا نەکرا، خێرا، خێرا، وەختێ خۆمان دیەوە لەشار دەرچووین و ڕووە و دوورکەوتنەوە ملی ڕێگایان پێ گرتووین. ساڵێکی ڕەبەق بەسەر ئەم ڕەوانەکردنەدا ڕۆیی.

چۆن ڕابوێرڕا و چۆن گوزەران کرا نایەتە قەڵەم، نایەتە نووسین، نایەتە گێڕانەوە، ئەوەندە هەیە، وڵاتم لا خۆشەویستتر بوو، خەڵکەکەیم لا بەڕێزتر بوو، کەوتمە بیرکردنەوە لە چیاکان لە زستانا، بەفر، کلیلەی بەفر، چلورەی درێژی گوێسەبانەکان بەستەڵەك و هەڵخلیسکاندنی، لفرە، گوێ ئاگردان، کووره داخستن، خۆشی خۆشیمە هەفتەیەکی کە ماوەم تەواو ئەکەم ڕوە و شاەر جوانکیلە، بەرەو ڕۆژەکەم ئەگەڕێمەوە، سەرلەبەیانی ڕۆژێکی بەهاری نەختێ پیربووی گوڵە بەیبوونی سەربانەکانی خانووە پێشینەکانی شارەکە مل لە قێنەربوون بە دەم شەماڵی ئەو ڕۆژەوە. نەمڕوانییە ئەملاو ئەولا تا گەیمە بەردەرگای ماڵەوە، پاش پشوودان لەسەر کورسی ژوورەکەم ڕووم کردە خوشکە (..) وتم، ئەوان کوان؟ لە کوێن؟ کەس دیارنییە! مانای چی! وتی گەڕەم و خزمان هەموویان خۆیان ئامادە کردووە شەو دێن بۆ لات، وتم ئەی ئەو! سەری داخست، وتم توانای دەرد هەڵگرتن و خەفەتبارکردنی ترم نییە. کاسم ئێستە. دانیشتم، وتی: بێئەوەی سەرهەڵبڕی چەن ڕۆژێك ئەبێ و دەستی کرد بە گریان، گریا، گریا، کوڵم هەڵسا، خەریك بووم بدەمە پڕمە، خۆم ڕاگرت و دانم گرت بە خۆما. وتم: توخوا، تێم بکەیەنە چییە؟ مردووە؟!

پڕمەی زیاتر بەر بووەوە، وتی، نا نەمردووە، وتم ئەی چی وتی شووی کرد، وتم باشە چۆن؟ چۆن؟ چۆن؟..

وتی کەسوکاری پێیان لێ کردە کەوش و ناچاریان کرد و بڕیانە مێشکیەوە کە تۆ جارێکی تر ناگەڕێیتەوە و بەرنابیت و ناگەی بە گوڵی بەهارا.

ئەمەی بۆم گێڕایەوە بۆ نزیك، نزیك بیست ساڵێکە ئەوسا ئەمە نەبووم کە ئێستا ئەمبینی، ئەوسا سەرم، ماش و برنج نەبوو بوو وەکو ئێستا لۆچ لە دە موچاوما پەیدا نەبووبوو، بینین کز نەبوو لۆچ نەکەوتبووە پێش چاو و پێستی ڕوومەتم. وازم لێ بێنە، ئەها، لەو بەرەوە وەستاوە، باش نایەتە بەرچاوم، شتێك شێوە ئەکەم، ئێستێ خۆم وا ئەبینم، وام لەسەر چیایەك، تا چاو بڕکات ڕێچکە ئاو و دار و سەوزە گیایە، چیا دوورەکانی کە لە چیاکە، خۆم لە پەنا بەردێك هەڵخستووە سەر و چاوم تەم گرتوو لێ دیارە، لووتکە دوورەکانم تەماوی دێتە بەرچاو، وەکو لەسەر ئەو چیایە بڕوانمە بەردەمێکی دوور وا دێتە بەرچام، ئەو پەرینەوەی کە ئەوی لێ وەستاوە و چاوەڕێیە، پۆلیسی ڕێگا ڕێی بدات لەگەڵ ئەو خەڵکە بپەڕێتەوە. باش نایەتە بەرچاوم، چاوم بڕی ناگاتێ هەناسەم خەریکە سوار ئەبێ. دەستم بەرەو شل بوون ئەڕوات، زمانم لە ڕۆژی یەکەمی نەخۆشیەکەم گیرانی زیاتر لێ پەیدا بووە، دەستی ڕاستم قورسە، بەرەو قورستر بوون ئەڕوات، ئاخ، ئەوا پەڕیەوە ڕووی کردەوە ئەمبەر وا دیارە، ڕووئەکاتەوە بەردەمم، بۆ دواجار چاوپێکەوتن، بۆ دواجار چاپ بوونی وێنەی لەناو گلێنەکانما، سەرم لە جاران زیاتر گرانترە لە یەکەم بینینی ئەم ڕۆژە، تا ئێتسا هەست ناکەم بتوانم، هێز بدەمە خۆم و ڕاست بوومەوە. ئاخ توانای بینینیشم کەمتر بوو، پێش ئەوەی بگاتەوە ئەمبەر و بێتە بەردەمم، تکات لێ ئەکەم دەستێ بخەرە سەرشانی چەپم توانای خۆگرتنم نەماوە بەسەر کورسییەکەوە! ئەمەوێ یارمەتیم بدەی لە لەش گرتنا و تا تێپەڕ ئەبی، ئەوا نزیك بووەوە! خەریکە ئەگاتەوە ئەمبەر، ئێستا وا لەبەرامبەرم، توخوا، توندتر شانم بگرە با ئەم دیمەنە ڕاستییەی نە خەیاڵە نە چیرۆك نەبرێتە ژێر گڵ.

سەرچاوە: گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ساڵی 1979.



# چۆن ئەدەبی کوردی دراسە بکەین؟

دیلان

چۆن ئەدەبی کوردی دراسە بکەین یا ڕاستتر چۆن شیعری کوردی دراسە بکەین؟

ئەوەی ئاشکرایە هەتا ئەم کاتە ئەدەبی کورد بە (مەفهومی) دراسە کەسێك نییە و نەبووە "دراسەیەکی شامل و عیملی" شیعری کوردی کردبێ. بەڵی شیعری کورد "ترجمە" کراوە بۆ چەن زمانێکی بێگانە چەن (تعلیقاتێکی) لەسەر دراوە، جۆرەها ڕەئی بەرامبەری وتراوە، هەندێ ئەڵێن جارێ باش ساغ نەبۆتەوە کامیانە، پێشکەوتووە یا دواکەوتووە؟!

گومانی تێدا نییە کە ئەدەبمان هەیە و ئەدەبەکەمان پێویستی بە لێدوانە. بەڵام کە هاتینە سەر لێدوان ئەبێ بە چ معیارێك بێین هەڵی سەنگێنین و ڕای بەرامبەر بدەین. ئایا (خصائص و ممیزاتی) شیعر و زمانی عەرەبی بکەین بە "معیار"ی شیعر و زمانی کوردی؟ مەسەلا کە پارچە شیعرێکی شاعیری هەرە گەورەی کورد (مەولەوی)مان هێنا سەر دەسگای شیکردنەوە هەموو دراسەکەمان بریتی بێ لەوەی (ئەم شیعرە نەزاکەتێکی تێدایە ئەوی تریان) فەنی بەدیعی تیا بەکارهاتووە ئەوەیان بەلاغەیە ئەمی تریان جناس و تەوریەیە ئەمە لەف و نەشری مشەوەشە ئەوەیان مورەتەبە ئەوە فەنی بەیانە، دەێ، دەی هەتا هەموو شعیرەکان ئەبێ بە نەشرەیەکی دەنگوباسی تەرجەمەکراو بە نیسبەت معیاری خصائص و ممیزاتی شیعری کوردییەوە یاکە هاتو هاتیتە سەر کێش و قافیە لە دەرگای ڕەخنەگرتنا بڵێی ئەم شیعرەیان بە مفاعل فعلات و.. ئەوی تریان بە مفاعل فعلات.. کورت دێنێ لەنگە، خوارە..

مامۆستا گۆران لە پێشەکی کۆمەڵە شیعرەکەیدا (بەهەشت و یادگار) ئەڵێ: تا بۆ دواجار وازم لە "عروض" هێنا و "هیجا" شێوەی پەنجەم کرد بە کێش و بۆ داڕشتنی هەڵبەست چونکە ئەم جۆرە لەگەڵ خصائص و ممیزاتی کوردیدا باشتر ڕێك ئەکەوێ. گۆران بۆچی ئەڵێ: (تا بۆ دواجار وازم لە عروض هێنا) چونکی زمانی کوردی کە شیعری کوردی پێ ئەوترێ جیاوازە و جیایە لەگەڵ ئەو خصائصانەدا کە زمانە دراوسێکان هەیانە بیئەی کوردستان کە جوانی سروشتی باش تێدا ئەبینرێ (مەڵبەندی ئیحایە بۆ ڕۆمانتیك).

ڕۆمانتیك لە ئەدەبی کوردیدا: نووسەری گەورەی جیهانی (ستیڤان زڤایج) لە دیراسەیدا بۆ تۆلستۆی ئەڵێ:

(لە کەلەبەرەی ژوورێکی تاریکەوە ئەڕوانمە چیایەکی ڕووناکی بەرز، چونکە ئەو زرووفەی کە تۆڵستۆی تێدا هەڵکەوت و ئەو قۆناغە چینایەتییەی کە تۆلستۆی تیا ئەژیا و ئەو قاڵبەی کە ئەدەبی ڕووسی تێدا مەیی بوو مەگەر هەر ئەو هەڵکەوتبێ بۆ ئەوەی ئەدەبی ڕووسی بگەیەنێتە لووتکە، مەبەست لەوەیە لە کاتێکا شیعری کوردی کاسی شیعرەکانی سەعدی و نیزامی بوو مووی عەروز خەریك بوو قوڕگی دائەبڕی، مەولەویمان تێدا هەڵکەوت کە ئەبێ لە کونی دەرزییەوە تەماشای ئەو کێوە گەورە ڕەنگاوڕەنگەی بکەین. ئەم پێشەکییە خێرایە ئەوەمان ئەداتە دەست کە ئەگەر هات و هاتینە سەر باسی شیعری کوردی و شیعری مەولەویمان کرد بە کەرەسەی لێدوان چار نییە و ئەبێ شیعری کوردی لە (نطاقی اقلیم)ی لە خصائص ممیزاتی عیبارە بێ لە خصائص و ممیزاتی شیعری عەرەبی بیگوێزینەوە بۆ نطاقی جیهان وە مەسەلەی لێدوانی زۆر قووڵترە بە ئەمە (تەشبیهێکی جوانە) یا بەسەر ڕاوەشاندنێك دوایی بێت.

## مەولەوی و ڕۆمانتیك

ژمارە تایبەتییەکەی (هیوا) کە بە بۆنەی نەورۆزەوە دەرچووبوو لەبەر دەسمایە و قەسیدە بە هارییەکەی مەولەویم جارەها خوێندەوە کە ئەڵێ:

وەهارەن، سەیرەن، سەوزی دیاران

نم کەوت نەدیدەش چون بێداران

مانا ڕەوکەشییەکەی: بەهارە، سەیرانە سەوزەی قەدپاڵی شاخەکان کە بەیانیان گزنگی هەتاو ئەکەوێتە سەر شەونمی گیاکان لە چاوی یەکێکی شەو بێداری خەو لێنەکەوتوو ئەچێ کە بەیانیان فرمێسك زابێتە چاوی. ئەگەر هات و نم کەوت نە دیدەش چۆن شەو بێداران بە (معیاری) (تشبیه) لێك درایەوە ئەوە شیعرەکە مجرد و ڕووت و سادە دێتە بەرچاو و گوێ، بەڵام سەرنجێك لە شاخەکان لە مانگی (گوڵان)دا کە مێرگی قەدپاڵەکان شەونمی کەوتۆتە سەر و گزنگی هەتاو بریقە و ورشەنی پێ پەیدا

کردووه لە چاوی شەوپێدارێك ئەچێ کە فرمێسك زابێتە چاوی لەبەر بێخەوی. کام شەو بێدار؟ (شەو بێداری ئازاری دڵ، ئازاری چەوساندنەوە، شەوبێداری دەرد و مەینەتی، شەوبێداری بە ئاوات نەگەیشتن.. هتد). لێرەدا بەلای کەمەوە سێ (سبب) دێتە بەردەستمان کە بۆچی شەو بێدارە؟

یەکەمیان: (ناحیەی انسانی) کە چەوساندەوەیە.

دووەم: ناحیەی طبقی کە دەردو مەینەتە.

سێیەم: اجتماعی کە بە ئاوات نەگەیشتنە.

ئەمە بێجگە لە عاملی ترس لە خودا و وجدانیەت. جوانی سروشت تێکەڵکردن بە هونەری شیعر ئەبێ بە (ابداع) کە ئەمەش ڕاستەوڕاست ڕۆمانتیکە لە شیعری کوردیدا.

لەژێر ناونیشانی فەلسەفەی پیرەمێرد چەند جارێك ئەم شیعرەم خوێندۆتەوە کە لە سەرەتاوە ئەڵێ:

ئەبێ بەخشندە مل کەچ کا لە ڕاستی موچەخۆری خۆی
سوراحی بۆ پیاڵە سەرفرودێنێ کە تێ کا بۆی

(پوشکین) شاعیری بەناوبانگی روسی لە یەکێ لە پارچە شیعرەکانیا بەرامبەر بە قەیسەر هونەرێکی سەیری بەکارهێناوە. ئەگەر ئەو چەن شیعرە وەکو دێڕ بخوێنینەوە هەمووی مەدحەو ئەگەر "افقی" بخوێندرێتەوە هەمووی زەمە بۆ قەیسەر. بۆچی پوشکین ڕاستەوڕاست نەهاتووە سەروگوێلاکی قەیسەر بکوتێتەوە کە قەیسەر نموونەی سەم و جەور بوو؟ چونکی قۆناغی ئەوسای ڕوسیای قەیسەری و جۆری بیرکردنەوەی پوشکین بەرامبەر بە شیعر و چۆن وتنی شیعر بە نیسبەت ئەو سەردەمەوە لەگەڵ نەوعیەتی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی کە بە ئاشکرا پوشکین شیعری تێدا بڵاوئەکردەوە لەوە زیاتر نەی ئەتوانی بچێتە ڕادەی ڕووداوەکانەوە لەبەرئەوە ماوەیەکی زۆر لە ژیانی شیعری پوشکین بریتییە لە شیعری ڕەمزی لە ژیانی کوردەواریشدا ماوە (قۆناغ) هەیە شاعیرەکانمان کوتومت نەیانتوانیوە بچنە ڕادەی ڕووداوەکان (مستوی لاحداث)ەوە لەبەر چەن هۆیەك یا ڕۆژنامە و گۆڤارەکان لەوە زیاتری پێ نەکراوە وە یا شاعیرەکە زیاتری بە ڕاست نەزانیوە ڕمی توانج و تانە و ڕەخنە ئاڕاستەی بەرامبەرەکەی بکا، لەبەرئەوە ناچار بووە پەنا بەرێتە بەر ئەدەبی (ڕەمزی) ئەدەبی ڕەمزی و شیعری کوردی.

مامۆستایانی ڕێبازی ڕیالیزم لە شیعردا ڕاستەوخۆ نەهاتوون ئەدەبی ڕەمزی پێشێل بکەن. بە پێچەوانەی ئەوەوە کە هەندێ لە خوێندەواران تێی گەیون. مامۆستاکانی ڕێبازی ڕیالیزم "مدرسەی واقیعی" هێرش ئەبەنە سەر شیعری ڕەمزی لە کاتێکا توانا هەبێ ڕاستەو ڕاست بڵێی، بۆ خەڵك بنووسیت، لە کاتێکا هێرش ئەبەنە سەر ئەدەبی ڕەمزی کە ئەو جۆرە شیعرە خەڵك ڕابکێشێ بۆ لای خۆی و خەڵك لە ئەدەبێکی جەماوەری ئاڕاستەکار دوربخاتەوە. بەڵام لە کاتێکا لەسەر (جووڵەی موو، خرتەی دان) خەڵك ئازار بدرێ وە خاوەن پێنووس ئەتوانێ خۆی ڕابگرێ و جۆرە بیرکردنەوەیەکی دیاریکراویش ڕایبکێشێ بۆ خۆڕانەگرتن ناچارە پەنا ئەبا بۆ چەن جۆرێ لە شیعری ڕەمزی وە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەچێتە ڕادەی ڕووداوەکان وەکو لە پێشەوە وتمان چەن جارێ لە ڕۆژنامەی ژیندا لەژێر "عنوانی" فەلسەفەی پیرەمێرددا ئەو قەسیدە بڵندە بڵاوکراوەتەوە. لێرەدا دوو شیعری ئەو قەسیدەیە ئەگرین و ئەیهێنینە سەر دەسگای لێدوان:

لقی شۆڕی درەخت میوەی ئەخۆن بێ ئەرکی بەرد و دار
پەلی بەرد بۆ پەلی بەرزە لەقەیشە بۆ لقی بەردار

ئەگەر هات و لق و درەخت بەرد و دار، پەل و پەل، لەقە و لەق، هاونیشتمانە باوەش "تطابق" لەگەڵ "خصائص"ی شیعری عەرەبیدا ئەبێ بڵێین پیرەمێرد لە (محناتی لفظی) بەولاوە جۆرە هونەرێکی تری بەکارنەهێناوە بەڵام ئەو درەختانەی لقیان شۆڕە پێویست بە بەرد و دار ناکات تێی گری و هەر سووك و ئاسان دەستی بۆ بەرە و میوەکەی بکەرەوە ئەو کەسانەی کە سەرشۆڕ و ملکەچن لە ژیانیانا وە توشی دەردەسەری و ئازار نابن و بەرد و داریان بەرناکەوێ وەکو لقی شۆڕی درەخت وان کە بێ ئەرکی بەرد و دار دەس بەرە بەرەکەی بچنە!

(ضربە) هەر بۆ ئەو ئینسانانەیە کە پەلیان بەرزە، سەرکەشن، مل ڕەقن، بەرز و بڵند ئەڕۆن لە خەباتا لەبەرئەوە لەقە "طبیعی" بەر ئەوان ئەکەوێ. بەرد و داری ئازاردان و ستەم و جەور هەر بەر ئەوان ئەکەوێ. بەر ئەو کەسانە ئەکەوێ کە بەریان هەیە بۆ نەتەوەکەیان شیعرێکی تری ئەو قەسیدەیە ئەڵێ:

ئومێدی لەسەر دەرکەوت ئەوانەی ڕاست و ڕووناکن
قەڵەم هەر سەر قەڵەم مۆم بۆ مقەست هەر بۆ ئەوەش چاکن

ئەگەر هاتوو دووبارە ئەم شیعرە بە معیاری شیعر و سیفاتەکانی شیعری عەرەبی وەرگیرا ئەبێ بڵێین: بێجگە لە (محسناتی لفظی و نثری مرتب) بەولاوە هیچی تری تێدا نابینرێ.

بەڵام: ئومێد سەرلەسەر دەرکەن ئەوانەی ڕاست و ڕووناکن– ئەو کەشانەی ڕاستن لە ژیانا لەگەڵ نەتەوەکەیا لە تێکۆشانا و ئەو تێکۆشانە ڕووناکییە بۆ ڕێگای بە ئاوات گەیشتن و ڕووناکی ئەدەن بە دەوروپشتیان وەکو (قەڵەم و مۆم) هەر لە سەرەوە دائەدرێ و ئەقرتێنرێ. قەڵەم هەر لە سەرەوە دائەدرێ و مۆمیش هەر لەسەرەوە ئەقرتێنرێ. لەبەرئەوە ئینسانە ڕاست و ڕووناکەکان ئەبێ بە تەمای (سەر) نەبن بە تەمای ژیان نەبن ئەبێ خۆیان ئامادەکەن بۆ مردن لە پێناوی ڕاستی و ڕووناکی بۆ گەلەکەیان، هەر بۆ ئەوەیش چاکن.

لێرەدا ئەوپەڕی "تضحیە" لەم دوو سێ وشەیەدا ئەبینرێ مۆم ئەبێ بسووتێ بۆ ڕووناکی قەڵەمیش ئەبێ دابدرێ بۆ نووسین، ئینسانە ڕاستەکان هەر ئەبێ ببن بە قوربانی و ڕووناکەکانیش ئەبێ بسووتێن و بۆ ئەوەی تاریکی مەڵبەندەکەیان ڕووناك بکەنەوە. ئەم شەرحە سەرپێییە ئەمانبات بۆئەوەی جوانترین شێوەی شیعری ڕەمزی[1] مان بەردەست کەوێ لە شیعری کوردیدا.

لە دوو ژمارەی ڕابردوودا یەکەمیان هەوڵێك بۆ گواستنەوەی شیعری کوردی بۆ ڕیزی ئەدەبی جیهان و تاقە شیعرێکی قەسیدەیەکی مەولەویمان بۆ نموونە هێنایەوە. دووەمیان هەوڵێك بوو بۆ بەراوردکردنی شیعری کورد لە بارەی ورد قووڵی ماناوە هونەری شیعری و داڕشتنی ڕێکوپێکی زمان و (ئسلوب) لەگەڵ ئەدەبی تری جیهاندا. مەبەستمان لە بەراوردکردن و هەوڵدان بۆ گواستنەوەی شیعری کوردی لە ئەدەبێکی ناوچەییەوە بۆ ڕێزی جیهان ئەمانەوێ سێ چوار بخەینە ڕوو.

یەکەم: ڕزگارکردنی شیعری کوردی لە خصائصی شیعری عەرەبی مانای چی، یانی بیسەلمێنین کە شیعری کوردە دواکەوتوو نییە. دواکەوتوو نییە نە لە بارەی ئوسلوبەوە نە لە بارەی داڕشتنەوە "سبك". نە لە بارەی نیازەوە "غایە". نە لە بارەی زنجیری فکرییەوە.

دووەم: بیسەلمێنین کە لە شیعری کوردیدا "تدرج" هەیە. یانی چی؟! لە دەستپێکردنی قەسیدەکەوە تا تەواوبوون شیعر لەگەڵ شیعر سەرکەوتن لە هونەری شیعری و ئامانجی شیعر و هۆنینەوە لە مەبەستا وە ڕاکێشانی خوێنەر بۆ ناوەڕۆکی بابەتی شیعرەکە.

داستانەکەی مەم و زینی خانی بەرزترین شێوەی "تدرج"ە لە دەستپێکردنەوە کە بە ستایشی خودا دەست پێ ئەکا و کوردایەتی ئەکا بە پێشەکی بابەت و ڕۆژی نەورۆز ئەکا بە ڕۆژی بە یەکگەیشتن هەتا ئەڕوا هەر سەرکەوێ هەتا ئەگاتە لووتکە،. تا دێت لە هونەری شیعر و ئوسلوب و مانا و وردەکاری و داڕشتنا هەر سەرئەکەوێ تا تەواو ئەبێ.

سێیەم: بیسەلمێنین کە بابەتەکانی ئەدەبی جیهان (کلاسیك، دراماتیك، ڕۆمانتیك، ئیلتیزام، واقعیەت) لە شیعری کوردیدا نەك هەیە بەڵکو بە زیادەوە تیادا دەرئەکەوێ.

چوارەم: بیسەلمێنن کە لە بارەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتییەوە بەو ئیعتبارەی کە شیعر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە هاوهەنگاوی قۆناغەکانی کۆمەڵایەتی کوردی کردووە وەکو نەتەوەکانی تری جیهان. بۆ نموونە لە یەکەم دەستپێکردنی بزووتنەوەی نیشتمانی کوردەوە تا ئیمڕۆ شاعیرمان هەیە زۆر باش لەگەڵ ڕووداو و شۆڕشەکان ڕۆیشتووە و شیعرەکانی تا ئێستاش بەستەی سەردەمی ئەم خەڵکەیە وەکو (بێکەس، پیرەمێرد) جا ئەگەر هات و توانیمان بیسەلمێنین کە شیعری کوردی ئەو لایانەی تیادا هەیە وەکو وتمان ناچارین بیگوێزینەوە بۆ ڕادەی جیهانی وە مەسەلەی دراسەکردنی ئەبێ بە مەسەلەی ڕزگارکردنی لە سیفاتەکانی شیعری عەرەبی. لە پێشەوە وتمان: بیسەلمێنین کە دواکەوتوو نییە.

وە سەلماندنمان کە دواکەوتوو نییە و ڕزگارکردنی لە سیفاتەکانی شیعری عەرەبی مانای ئەوە نییە شیعری عەرەبی دواکەوتووە. نەخێر، بە پێچەوانەوە مانای ئەوەیە خوێندەوارانی کۆن و تازەش هەندێکیان کە هاتنە سەر لێکدانەوەی شیعری کوردی دێن بە تەرازووی سیفاتەکانی شیعری عەرەبی شیعرە کوردییەکە لێك ئەدەنەوە. وەك وتمان ئەمە. جناسە، ئەمە تەوریەیە، مانای ئەوەیە خاسیەتەکانی زمان و شیعری عەرەبی ئەوەندە زاڵە بەسەر ڕۆشنبیری و شیعری هەندێ لە شاعیرە کۆنەکانماندا هەچ شیعرێك هاتە سەر دەسگای یەکالاکردنەوە خێرا یەکێ لە سیفاتەکانی شیعری عەرەبی ئەدرێتێ.

وتمان شیعری کوردی دواکەوتوو نییە بە تایبەتی لە بارەی ئوسلوبەوە. چۆن؟ حەمدی ئەڵێ:

سوبح پێ ناکەنێ تا بێ نەوایە شەو بە دڵ نەگری

گوڵێ ناپشکوێ تا بولبولی سوبحێ بە کوڵ نەگری

توازن لە نێوان شەو لە پاشا ڕۆژ، گوڵ و بولبول، گریانی بولبول بەدیار گوڵەوە بۆ ئەوە سەرلەبەیانی یەك دوو دڵۆپ عەتر بمژێ، فەرامۆشکردنی لە بەری بەیانا و بە ئاگاهاتنی کە گزنگ هەڵات و عەترەکە با بردی دووبارە توازن لەمیان بێ نەوایە، ناکامی، بەئاوات نەگیشتوویە تا بولبولی پاش عەتر بابردن بە کوڵ نەگری گوڵێ ناپشکوێ، تا گریان نەبێ هەرچەندە گریان لێرەدا بە ڕووتی وەرناگیرێ گریان مەبەست لە تەقەلایە لە کۆششە لە تواناوەیە بۆئەوەی ڕۆژ هەڵبێ بۆئەوەی سەرفرازی کە ڕووناکییە بێتە ناوەوە.

تا بێنەوایەك نەگری "صبح" هەڵ نایەت، تا بولبولێ نەخوێنێ لە خوێندنەکەی نەگرێ گوڵ ناپشکوێ، تا دەنگدارەکان خاوەن زمان و بیروڕا نەکەوێە ناوەوە نەڵێت، تا ڕێوشوێن دانەنێت، وتمان هاوکێشەیی لە نێوان شەو و ڕۆژ، تاریکی و ڕووناکی جوانی و بۆ جوانی خوێندن یاخود شادمانی و بەختیاری لەگەڵ دۆزینەوەیدا لەگەڵ دەستکەوتنی ئەم بەرامبەریە ڕەوانتر لە شیعرەکەی تریدا دەرئەکەوێ کە ئەڵێ:

بەری نابێ درەختی باخی عالەم تا هەموو وەک یەک

بە یەک سۆز و بەیەک شۆڕ و بە یەک دەم چڵ بە چڵ نەگری

حەمدی مەسەلەی شەو و ڕۆژ و گوڵ و بولبول مەبەستەکەی خۆی بە دەستی خۆی

شیعری کوردی لە چوارچێوەیەکی ناوچەییەوە گواستەوە بۆ جیهان؟ چۆن؟

بەری نابێ درەختی باخی عالەم تا هەموو وەک یەک

درەختی باخچەی ژیانی ئەو دنیا فراوانە کە جۆرەها نەتەوەی تیا ئەژی و هەریەکە خاوەنی زەوی و زمانێك و ئەدەبێك و مێژوویەك و ڕۆشنبیرییەکە و بە تەمان هەر نەتەوەیە وەکو برا بە هاوکاری لەگەڵ یەکدا بەر لە باخی ژیان و بەروبوومی زەویوزار و ئاشتی بخۆن. ئەو درەختی باخە بەری نابێ تا هەموو وەك یەك هیچ نەتەوەیەك دەست بۆ ئەوی تر درێژ نەکا و ئەم بە سووك و ئەو بە قورس نەدرێتە قەڵەم و ئەمبەر ڕەش و ئەوبەر سپی تەماشا نەکرێ و ئەو درندە و ئەو مەڕ نەیەتە بەرچاو. تا هەموو وەك یەك تێئەکۆشن بۆ بەختیاری بۆ ئازادی بۆ وەك یەکیی. درەختی باخی ژیان سەری نابێ تا: بە یەك سۆز و و بە یەك شۆڕ و بە یەك دەم چڵ بە چڵ نەگری.

تا بۆ یەك ئامانج بە یەك جۆر دەنگ بە یەك جۆر تێکۆشان تا بە یەك دەم چڵ بە چڵ نەگری. تا بە یەك بیر و تێگەیشتن ئەو لقی درەختی باخە هەوڵ نەدات (لقەکان) کە نەتەوەکانە توازن لە مەراما لە نیازدا لە پارێزگارکردنی وەزن و قافیەدا باشترین شێوە (ئوسلوبە) لە شیعری کوردیدا ئەو دوو شیعرەی کە بۆ نموونە هێنامانەوە. وتمان دواکەوتوو نییە لە بارەی داڕشتنەوە. (سبك) چۆن؟

دووبارە حەمدی ئەڵێ:

بازاڕی دەهرە قیمەتی ئەشیا بەجێگەیە

مێشێ گەیشتە ڕووی نیگارێ لە خاڵ ئەچێ

(داڕشتن) لە لایەن بازاڕ و شتومەك، نیگاری جوان و بەنرخ، داڕشتن لەم شیعرە عەرەبییەدا کە بۆ نموونە ئەیهێننەوە، بیهێنینەوە بەرچاو کە ئەڵێ:

والنير كالتراب ملقى فى اماكنه

والعود فر ارچه نوع من الحگب

ئاڵتون لە جێی خۆیدا وەکو گڵ وایە داری عودی بۆن خۆشیش لە جێی خۆی وەکو دار وایە. داڕشتن لە لایەن ئەم شیعرە عەرەبییەوە لە یەك وەتەری دیاریکراو ئەدا کە تەعبیرە بۆ مەبەستێکی لەبەرچاو! بەڵام زۆر زۆری لێ زیاد کردووە کە حەمدی ئەڵێ: بازاڕی زەمانەیە نرخی شت بە جێگەیە وەك ئەوەی مێشێ بە دەموچاوێکی جوانەوە بنیشێتەوە لە خاڵ ئەچێ چونکی جوانی دەموچاوەکە نرخ بۆ مێشەکەش پەیدا ئەکات.

وتمان دواکەوتوو نییە لە بارەی نیازەوە "غایە"وە نە لە بارەی زنجیرەی بیرەوە چۆن؟ یەکێ لە شاعیرەکانمان ئەڵێ:

بێ تۆ چاو لاڵی بینینە

ئەی خوای ورشە

سەرنج قولانجێ بڕ ناکا

ئەی درەوشە، کزی هێزە

نیگا بێ کێش و بێ پێزە

بێ تۆ ئەی چیایە گزنگ

ئەی دەریایە نمی ئاورنگ

ئەیبەهەشتی ژینی شادی

وەی ئازادی

جارێ لە بارەی یەکێ لە سیفەتەکانی چاوەوە چاو لاڵی بینینی لاڵ "ناوی تایبەتە" بۆ زمان، لات بۆ بەڕن، کێش و پێز بۆ گەنم و دانەوێڵە لێرەدا لاڵ، لات، پێز بە مجاز وەرگیراوە بۆ چاو بۆ بینین کە ڕەونەقی لێوردبوونەوە زیاتر دەرئەکەوێ ئەگەر بوترێ (چاوکزی بینینە) ئەگەر ڕاستەوخۆ وترا سادە دێتە بەرچاو لە پاشا چاو لاڵی بینینە لاتیی تینە، کزی هێزە، بێ کێش و بێ پێزە. بۆچی؟ بۆ سەربەستی، بۆ سەرفرازی، تەعبیر لەو چەن وشەی پێشەوەدا بۆ نیازێك کە سەربەستییە ورد و ڕێك هاتۆتە بەردەم. ئینجا بێینە سەر زنجیرەی فکریی -بێ تۆ چاو گۆناکا بۆ بینین ئەی خوای درەوشە و ورشە سەرنج هەر چاو نیگا هەر چاو لە سەرەتاوە بە سێ چوار قۆناغی داڕشتن کە هەر مەسەلە چاوە بۆئەوەی لە غایەکەی بگەیەنێ کە ئەو هەموو دەرد و دووەی بەسەر چاوا دێت لەبەر نەبوونی خوای ورشەیەکە بریتییە لە سەربەستی. لەبەر نەبوونی کێوی گزنگە، ئۆقیانوسێ شەونمە کە بریتییە لە ئازادی. زنجیرەی بیری لەو پارچە شیعرەدا کە بە نموونە هێنامانەوە شێوەیەکی ڕەوونەقداری شیعری کوردیمان ئەداتە دەست. مەولەوی ئەڵێ:

قوربان قوربانەن جەژنەن شادیەن

دەس لەملانە ڕووی ئازادیەن

مەولەوی لەم قەسیدەیەدا بابەتێکی گرتووە بە دەستەوە شیکردنەوە و چارەسەریشی بۆ داناوە ئەڵێ: جەژنی قوربانە هەندێ دەس لەملانن و گەردن ئازادی ئەکەن هەندێکیش چاوەڕێن بکرێن بە قوربانی.

مەولەوی ئەیەوێ خۆی ببێ بە قوربانی ئەڵێ:

بیکە وە خاتر جەژنی قوربانە

بمکە وە قوربان ئەو باڵا جوانە

لە پاشا ئەچێتە دنیایەکی، دنیایەکی تری تەعبیرەوە کە ئەڵێ:

خۆ بۆ تۆ جەژنی قوربانی ئەبێ

بۆ منیش مەرگی ئاسانی ئەبێ

لە پاشا بیرئەکاتەوە کە قوربانی سیفاتی هەیە، یەکەم ئەبی گەنج بێ، بێ نەخۆشی بێ، دانی نەکەوتبێ، مەولەوییەکی پیری چاوکزی دەردەداری مەینەت و دەردو دوو دیو و سیفاتەکانی قوربانی لەگەڵدا ناگونجێ کە ئەڵێ:

قوربانی مەشیو جەعەیب بەری بۆ

فدای خاک پای ڕای دولبەری بۆ

تۆ پاشکستەی بەردی هەردی دەرد

چەم کوری مەینەت تەن لاغر ڕەنگ زەرد

تۆیەکی پێ شکاوی بەردی هەردەی دەرد و دوو مەینەتی، چاو کوێری دەردیسەری لاتی نەبوونی ڕەنگ زەردی هەناسەی ڕەش سیفاتەکانی قوربانی چۆن بەسەر ئەوا ئەچەسپێ.

ئینجا ئەگەڕێتەوە و ئەڵێ:

خەیاڵت خامەن جەوری نادانی

لای لایق وەتون ڕوتبەی قوربانی

هەی هو خەیاڵێکی خاو ڕوتبەی کە مەولەوی خۆی لە چەند ساڵەوە بۆ ئامادە کردبوو، لایەق بەو نین. لە یەکەم شیعرەوە قوربانی قوربانە بۆ جەژن بۆ قوربانی سەربڕین خۆئامادەکردن. سیفاتی قوربانی نەبوونی لە مەولەویدا و بە ناکامی گەڕانەوەی بۆ شارە وێرانەی مەئیوسی.. ئینجا زنجیرەی فکر هەر ئەوەندە ئەتوانرێ زاڵ بکرێ بەسەر بابەت "موضوع"ێکدا.

وتمان بیسەلمێنین کە لە شیعری کوردیدا بابەتەکانی ئەدەبی جیهان هەیە ئەو بابەتانەی کە بە لایەن جۆر هاوڵاتی جیاجیاوە سنوور نییە بۆ ئەدەب. بە مانای پارچە شیعرێ یا پەخشانێ یا چیرۆکێکی بە زمانی ئەڵمانی هۆنراوەکە گۆڕایە سەر زمانێکی تری وڵاتەکان ئەو تام و بەرامەیەی کە بە زمانەکەی پێی وتراوە هەمان تام و بەرامەش ئەدات بەو زمانەی کە پێی ترجمەکراوە. بۆ نموونەش بە دواجار دوو بابەتمان خستە پێشچاوی خوێندەواران یەکەمیان ڕۆمانتیك، کە بە سەرەتای قەسیدەکەی مەولەوی (وەهارەن سەیرەن). دووەمیان ڕەمزی کە بە دوو شیعری پیرەمێرد لقی شۆڕیدرەخت پیشان درا. هەچ نەتەوەیەك گەورە یا بچووك سەربەخۆ یا ژێردەستە، پێشکەوتوو یا دواکەتوو کە هاتو خاوەنی زمان و زەوی و مێژوو و جێگای دیاریکراوی خۆیبوو، هەچ نەتەوەیەك کە ئیش دابەش کرا تیایدا ئەوە میر، ئەوە گەدا ئەوە شوان، ئەوە ئاغا، ئەوە کاسب، ئەوە.. هتد. ئیشکەر. یانی کە تێکەڵاوبوونی کۆمەڵایەتی کەوتە کار و بۆ پێشەوە چوون وە هۆی چینایەتی دەستی کرد بە سنوور دانان بۆ بەرزی و نزمی، تێری و برسێتی و دەستگەیشتنە شت و دەست نەگەیشتنە شتی خەڵك بە لایەن ئەدەب و هونەری ئەو خەڵکانەشەوە بابەت پەیدا ئەبێ نەتەوەی کوردیش وەکو نەتەوەیەکی خاوەن قەوارەیەکی تەواو دیاریکراوی خۆی وە لەبەرئەوەی تا ڕادەیەك ناکۆکی چینی لە نێوان دوو دەستەی دەرەوەی شاری کوردستان هەبووە لە شیعری کوردیدا دراماتیك پەیدا بووە.

هەی سوار سوار بێ هەی تفەنگچی دەس باتە تفەنگ

هەی کچی جوان ئارایشتی خۆی کا بۆ ئاهەنگ

لە ژیانی کوردەواری لادێدا ووك لەم دێوە بۆ ئەو دێ بە تەقە و ڕمبازی و بەزمەوە ئەبرێ پاش ئەوەی جوانەکان خۆیان ئەڕازێننەوە، بۆچی؟

لەژێر تارای سورمەچنا هەرە جوانی دێ

کچی جوتیار بەرەو کۆشکی ئاغا کەوتە ڕێ

ئەشێ کیژێکی جوان بەبێ ئەوەی بە ئارەزوو و ئاواتی خۆی خرابێتە ژێر تارای سورمەچن لە چاوگەیەکی بە تەیمان تەنراوەوە ڕووە و کۆشکێ خرابێتە ڕێ کام کچ؟

کچی جوتیار بۆ بەهەشتی ژین و دڵداری

لەگەڵ کوڕی شوان بەستوی پەیمانی یاری

ئەو کچەی بە پێچەوانەی ئەو جێگا و ڕێگا و ناز و نیعمەتەی کە ئێستێ بۆی ئەبرێ لە زووەوە لەگەڵ کوڕی شواندا پەیمانی خۆشەویستیان بەستبوو کام کوڕ؟

کوڕی شوانی برژاوی ئیش لەبەر هەتاو قاڵ

مەچەک ئەستوور لەش کەڵەگەت دەفەی ناو شان چاڵ

لێرەدا گۆڕان چەوساندنەوەی چینایەتی زۆر باش دەرخستووە، کوڕی شوانی برژاوی ئیش کە ڕۆژ هەتا ئێوارە بە بەفر و بە باران بە با بە گەرما ئەبێ بەو هەردە و بەردەوە مەڕ بلەوەڕێنێ ئەو جۆرە وەرزشەش مەچەکی ئەستوور کردووە و دەفەی ناو شانی چاڵ کردووە ئەم کوڕە شوانە چی لێ هاتبوو:

تیری خوای عەشق هەتا شاپەڕ دڵی سمی بوو

کچی جوتیار لەبەرچاوی بت بوو پەری بوو

ئیتر ڕەهەندەی شاخ و داخ دۆزەخی بەبەردا هەڵگەڕان، کزەی ئێسك کونکەر لای ئەو بایی هەوا بوو چونکی تیری خوای عەشق دڵی سمیبوو! لەو لاشەوە کچە: ئەو نازدارەش بە شەو و بە ڕۆژ نەخشی خەیاڵی کوڕی شوان بوو باڵای بەرزی ناوشانی چاڵی کەواتە ئەگەر هات و بە پێچەوانەی تارای سورمەچنەکە لەژێر ئەو ئاڵووالایەدا دڵێکی ناکامی بە زۆر ڕاکێشراو ببینین سەیر نییە کە ئەڵێ: ئاغای خاوەن هێز و شکۆ خاوەن سامداری لە کاتێکا درێژ ئەکا دەستی دڵداری بۆ گەردنی گوڵی کێوی لە جێ هەڵکەندراو نمی فرمێسك بەدی ئەکا لەسەر کلی چاو ئەم ڕاستییەش هەموو کەسێ لێی ڕوون بوو بەرد و داریش چون: هەتا ڕێگای دارستان و ناو ڕان و دێبەر بوو بە شانۆی سەرگروشتەی دڵدار و دولبەر هەرچی دار و دەوەنی ئەو مەڵبەنە هەیە هەموو ئاگاداری ئەو عەشقە پاکە بوون، بەڵام ئەنجام چۆن بوو؟ کارەسات چۆن گۆڕا، تا کوێ دڵدارییەکە بڕی کرد.؟ ئەبێ ئەو دڵە لە لێدان بوەستێ چونکە "تفاعلە اجتاعیە" کە (عاملە طبقیەکە) ئەوە هەڵئەگرێ. چۆن:

پەنجەی کینە لەسەر پیلکەی تفەنگ کەوتە کار

کۆستی دڵی بۆ ئێجگاری کەوت کچی جوتیار

شوانە کوژراو:

ئێستاکە ئەوا هەرچی بڵێی نیعمەت و نازە

هەمووی ئەدا بە یەک دڵۆپ فرمێسکی تازە

کە ئەنجامەکە دراماتیکە

**سەرچاوە: ڕۆژنامەی ژین، ژمارەکانی (** 1683-1688 **) بەشی یەکەم لە** 1962/7/5 **بڵاوبۆتەوە.**

# دیدار لەگەڵ دیلاندا

سازدانی: نیشتمان عومەر

خوشك و برایانی ئازیز میوانی ئەم جارەمان جیاوازە لەگەڵ میوانی ئەڵقەکانی پێشوو، ئەڵقەکانی پێشوو چاوپێکەوتن و دانیشتمان لەگەڵ ئەو هونەرمەندانەدا بوو کەلە بواری ئاواز و گۆرانیدا خۆیان بەخت دەکەن. بەڵام میوانی خۆشەویستی ئەم جارەمان ئەدیبێکە کە ئەویش مامۆستا دیلانی شاعیرە، وەکو خۆشتان دەزانن مرۆڤی بەرز لەهەر بوارێکدا کاربکات پێویستی بە ناساندن نییە لەناو ئەو کۆمەڵەی تیای دەژی، چوون بینینی کارەکەی یان بیستنی بەهرەکەی خۆی لە خۆیدا وەسفێکی تایبەتی ئەو مرۆڤە دەردەخات. جا با ئێستا پێکەوە بە وردی گوێ شل بکەین بۆ بەرهەمی جوان و باسوخواسی مامۆستا حەمە ساڵح دیلان:

## ئازارشکێن
## خەستەخانەی دڵ

**بە دەنگی دیلان**

شەو درێژە درێژی لەبن نایە
کێ شەبەقێ دەخاتە ئەم دەرگایە
کەی ڕۆشنایی ئەگاتە ئائەملایە
شەو درێژە درێژی هەر چوارلایە
شەبەق دوورە، گڵۆپەکان بێ شەوقە
شەپۆلی شەو لە گەردندا وەك تەوقە
چاوبڕ ناکا، گلێنەش لەمن ئەوقە
ئاخ، هاتوچۆی سێبەری ڕەش بە زەوقە
بۆ کێ بەرم دەستی چمك ڕاکێشان؟
خۆ دیار نییە ڕێگای دووری کاکێشان!
لە من و لە کۆڕی گەرمی دەروێشان!
کۆڕەکەی من بوو بە کۆڕی دڵئێشان!
سەر گێژە سەرینەکەم لاخوارەوە
ئەوپەڕەوەم بە ئاستەمێ لێ دیارە
تەنیشتم کفت بە ورتەیە جارجارە
هەستم خوێنە، سوك خول ئەخوا ئەمجارە
مۆتەکەیەك لەسەر سنگم وەستاوە
هەناسەم قورس بە دوو چنگاڵ گیراوە
چنگێکی تیژ لەبەر بینم خراوە
ئاخ بۆ فوویەك بچێتە قوڕگ لەملاوە

## فریشتە

ئەی فریشتە بەم شەوگارە درێژە
تۆ پێم ناڵێی کێیە خەریکی نوێژە
وتەیەك هات وتی کاکە لەمێژە
ئا ئەم خەڵکە بۆ ڕزگاربوون بوێژە
خۆ هەر تۆ نیت تۆ تەماشای دەوەن کە
سەختی چیا و بەسەتەڵەك و سەهەند کە
ئەو دڵانەی لەتلەتی ناو چەمەن کە
تۆش ژان و ئێش وەکو ئەوان پەسەند کە
خۆ تۆ لای خۆت بەستەبێژی ئازاری
بولبولێکی باڵ پێکراوی کەناری
هەردەگەڕی باخچەی گوڵی بەهاری
تۆ ئاوازی درێژی سەرچناری
تۆ دەنگخۆشی بنەڕەتی ئەم دەردەی
شاخ بڕوخێ تۆ لەو بناغە بەردەی
لەبن نایەی تۆ سەرچاوەی ئەم هەردەی
تۆ سروودی نەسڕاوەی ئەم کوردەی
لێوی چیا سوك بنێرە سەرسنگت
گەڵای بەڕوو بگرە بە هەردوو چنگت
دڵۆپ دڵۆپ بگاتە خوێن ئاورینگت
تێر بمژە دەمی هەڵاڵە و شنگت

ئازارشكێن

ئای چەند خۆشە بە ئاستەمێ گوێم لێیە
ئا ئەم دەنگە دەنگی دڵە هی كێیە
ڕێگا چۆڵ كەن ئازارشكێنی پێیە
دوو ئاوانە، تاڤگەی زەلمە یان زێیە؟!
ئەی چارەسەر ئەی موتورفەی ئاسمانی
تۆ ئەم چارەت لە كوێوە بۆ من هانی
تۆ خەیاڵی یان هەناسەی یەزدانی
وا لەپ نەرمی لۆكەی برینی گیانی
ئەی لێوتەنك ئەی پرچ ڕەشە ڕەیحانە
چی تۆی هێنا بۆ سرەوتی ئەم گیانە
كێ پێی گوتی سنگ بریندار دیلانە
وەرە پێشێ وادەی ئاخ هەڵكێشانە
وەرە پێشێ بەرامبەرم ڕاوەستە
لێت دەپرسم یەك دوو وشەم مەبەستە
تۆ بۆ دڵت لەگەڵ ئازار پەیوەستە
بەزەییە ڕێزگرتنە یان هەستە
پەیمانم بێ لەگەڵ فرمێسكی چاوم
لەگەڵ پرچی ئاڵۆسكاوی تاوتاوم
هەتا شێوەی ئێش بمێنێ لە ناوم
شەرتە نەمرم هەرگیز نەڵێم ماڵئاوا[2]

من ناوم محەمەد سالح كوڕی مەلا ئەحمەد دیلان كوڕی مەلا سالح كوڕی مەلا قایەری شەوخوێن كوڕی مەلا موحەمەدی كوڕی مەلا هەمزەیە، بناغەی خێزانی ئێمە یان بنەماڵەی ئێمە لەگەڵ دروستكردنی شاری سلێمانیدا لە قەڵاچوالانەوە هاتووینەتە سلێمانی، لە گەڕەكی گۆیژە نیشتەجێ بووین، باوكم كە ناوی مەلا ئەحمەدی دیلانە خوێندەوار بووە، بەڵام كاسبكاریی دەكرد، زۆر شەیدای شیعر بوو، هەرچەندە خۆی پێی نەدەگوترا شاعیر بەڵام زۆر باش لە شیعر دەگەیشت، بە تایبەتی شیعری كوردی و شیعری فارسی. چونكی خوێندنی ئەوسای ئەوان فارسی بوو، لە پاش خەتمی قورئان ئەلف و بێی تەواو كرد، لە یادی زۆر كەس لەوانەی كە بە شیعرەوە خەریك بوون، ئەگەر شیعرێكی حافزی شیرازی یان سەعدی یان نیزامی گەنجەوییان لا داخراو بوایە و بۆیان لێك نەدرایەتەوە دەهاتن پرسیان بە باوكم دەكرد، ئەیانهێنا بۆ ئەو بۆ ئەوەی بۆیان لێكاڵا بكاتەوە و تێروپڕ ماناكەیان بۆ لێك بداتەوە، ئەو ئاسمانەی كە من كەوتمە ناوی و ئێستا باسم كرد واتە باوكم و شیعر، باوكم و خوێندەواری، هەر لە منداڵیمەوە كاری تێكردبووم. دەستپێكردنی خوێندنم دەگەڕێتەوە بۆ مزگەوتی شێخ بابە عەلی كە لە گەڕەكی خۆمان بوو، بە ئەلف و بێ و خەتمی قورئانەوە خەریك بووم و تەواوم كرد، لە پاشان چوومە قوتابخانەی خالیدیە، قوتابخانەی دەستپێكردن (سەرەتایی)م تەواو كرد، چوومە ناوەندی، تا پۆلی سێم خوێند، سێم تەواو كرد. گوزەرانی خێزانیی ئەوسای ساڵانی 45 و 46 گران و ناهەموار بوو، ناساغیش ڕویكردە خێزانەكەمان بە تایبەتی باوكم، ناچار وازم لە خوێندن هێنا، لە كۆتایی ساڵی 46 بو 47 دامەزرام بە فەرمانبەر لە دائیرەی ئینحساری توتن لە سلێمانی، ئەوسا تەمەنم لە نۆزدە ساڵ تێنەئەپەڕی، لە پاش ساڵ و نیوێ كە لە فەرمانبەریدا مامەوە لە وەزیفە دەركرام، چەند مانگێكی پێچوو گیرام، درام بە مەجلیسی عورفی، حوكم درام، بەربووم، گیرامەوە، حوكم درام، بەربووم، گیرامەوە، تا ساڵی 1958 یازدە ساڵم بەندی و دوورخستنەوە هەیە، یانی گوڵی گەنجێتی خۆمم لەناو بەندیخانەدا بردە سەر، لە پاش ئەوەی لە 1958دا ڕژێمی پاشایەتی خرا گەڕامەوە بۆ وەزیفە، بوومەوە بە فەرمانبەر، بەڵام ئەمجارە لە دائیرەی ئینحساری توتن دانەمەزرامەوە، بەڵكو لە ئیدارەی مەحەلی (ناوخۆیی) پارێزگاری سلێمانی دامەزرام، بووم بە مەئمور مەخزەن. ساڵی 1986 خۆم خانەنشین كرد پاش ئەوەی بووم بە بەڕێوەبەری تەختیت بۆ بەڕێوەبەری كتێبخانەكان. ئەمە بە كورتی ژیانی من بوو لە منداڵییەوە وەكو فەرمانبەرێك وەكو نیشتمانپەروەرێك وەكو ئازاردیوێك وەكو ئازارچێژێك لە ڕێی ئەو هۆ و پەیوەستی و پەیوەندی نیشتمانییەی كە من هەمبوو بڕوا ناكەم تا ئێستاش بچڕابێت. لەو ماوەیەدا، كە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (50)، پێش ساڵی پەنجاش وەكو بەگوێگرانی خۆشەویستم گوت بە هۆی دەسەڵاتی خوێنەواری باوكم و ئەو دەسەڵاتە تایبەتییەی كە بەسەر شیعردا هەیبوو منیش حەزم لە شیعر دەكرد. دەستم دایە شیعرنووسین و شیعر بڵاوكردنەوە، لە ڕۆژنامەی ژیندا كە لە سلێمانی دەردەچوو و هەفتانە بوو، بڕوا ناكەم ئەگەر تەماشای ژمارەكانی بكەن لە 52 و 53 و 54 ئەگەر لە بەندیخانەشەوە ناردبێتم چڕبوو و پڕبوو لە بڵاوكردنەوەی شیعرەكانی خۆم. ساڵی 954 بڵێسەی بەرزبوونەوەی شیعر بڵاوكردنەوەم بوو. كە گەڕامەوە دوو كوڕاسی شیعریم بڵاو كردەوە، یەكێكیان شەڕ و ئاشتی، ئەوی تریان كونەپەپووی شەڕ، لە چاپخانەی ژین هەردووكیان چاپكران، وەكو دێتە یادم و دێتەوە بیرم لە یەك ڕۆژدا هەردووكیان نەمان و هەمووی سەرف بوو. لە 1957 ئەو شیعرانەی كە گوتبووم، هەموویم كۆكردەوە پاش كۆچی دوایی سەرۆكی گەورەی نەتەوەی كورد شێخ مەحمودی گەورە بە ناوی شێخ مەحمودی زیندووەوە هەموویم كۆكردەوە و چاپم كردەوە، لە ساڵی 1967 چی گوترابوو و چی نووسرابوو لە شیعرەكانی ترم دووبارە هەمووی كۆكرایەوە و بە ناوی دیلانەوە چاپكرا، دراسەی كوردیش یارمەتییەكی چاكی دام بۆ چاپكردنی. وەنەبێت لە شیعر نووسین وەستابمەوە ئەگەر لە بەندیخانەشدا بوویم شیعرم هەر نووسیوە و هەر بڵاوم كردۆتەوە. ساڵی 1969 دووبارە شیعری ترم بە دەستوخەت بڵاو كردەوە، كوڕاسێكی

شیعریم بڵاوکردەوە کە تازە بوو بە ناوی "پایزی جاران"، یارمەتیدەرم بۆ ئەمە مامۆستای بەڕێزم "عەبدوولڵا ئاگرین" بوو، لە ساڵەکانی پاش 1970، 74، 75 هەتا ئێستا، وەنەبێ لە شیعرنووسین و شیعروتن وازم هێنابێ زۆربەی ئەو شیعرانەی کە تا 1986 گوترابوو کە زۆربەی دەستکەوتبێ یان لەملاو ئەولا یان کۆکرابێتەوە بە ناوی دیوانی شیرەوە، بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری لاوان یانی ئەمانەی گشتی لاوان و ڕۆشنبیری لە منی کڕی و خۆی چاپی کرد بە ناوی دیوانی شیعرەوە بڵاوکراوەتەوە.

وا بزانم لە ماوەیەکی کورتدا نەما، ئەگەرەکو بتوانم و دەستکەوت هەبێ ئەوانی تری کە دەستم کەوێ کۆی بکەمەوە و چی تازەشی کە گوتوومە هەموویان بە نامیلکەیەکی تازەی بچووک چاپی دەکەین و بڵاوی دەکەینەوە.

*مامۆستا حەزدەکەین باسی ژیانی کۆمەڵایەتی و تایبەتی خۆتمان بۆ بکەیت.

ساڵی 1958 و دوای 58 دەتوانین بڵێین (59) خێزانم دروست کرد، ئێستا ئێمە لە ماڵەوە سێ کەسین. من و خێزانەکەم و کچەکەم کە فەرمانبەرە لە بەڕێوەبەرێتی پەروەردە، دوو کوڕیشم سەربازن، کوڕێکیشم قوتابییە لە کۆلیژی زانستی بەشی جیۆلۆجی.

وەکو دێتەوە یادم لە دانیشتنێکدا لەگەڵ خولێخۆشبوو شاعیری نیشتمانپەروەر فایەق بێکەس کە ئەو بە تەمەن زۆر لە من گەورەتر بوو ئەم شیعرانەم بۆ خوێندەوە:

منم بە دەستی چەرخەوە وا گێژ ئەخۆم
منم کە بوومە خوێنەخۆر و خوێنی خۆم ئەخۆم
منم لە بەحری خەیاڵاتی بێوچانی ماتەما
هەر پەل ئەگێرم نە کەڵك و نە سوود و علاجە بۆم
زامدارە بولبول و لە دەوری گوڵ ئەکا ڕەقس و سەما
بە کەیلی ئەشکی سوور سوور و ئەسەف و دەست و چاو ئەشۆم.

پاش خوێندنەوەی ئەم دوو سێ شیعرە، بێکەسی خوالێخۆشبوو گوتی ئەمە هی کێیە، گوتم هی خۆمە، گوتی شتی وا نییە، ئێ ئاخر چۆن من دەتوانم شیعری کەسێکی تر بە ناوی خۆمەوە بخوێنمەوە، گوتی ناچێتە مێشکمەوە، ئەمە دەستپێکردنی شیعرگوتن و شیعربڵاوکردنەوەمە.

وشەی بەهار چی دەنوێنێ لای تۆ؟

وشەی بەهار زیندووبوونەوەی وەرزی تازەیە، ڕزگاربوونە لە سارد و سۆڵە و بەفر و بەستەڵەکی زستان، لە کڕێوە، لە بەفر، لە هەرەسهێنانی بەفر، لە سەهەند، دروستبوونی چوزەرەی گوڵی تازەیە بە نێرگزەوە تا گوڵاڵە سوورە تا وەنەوشەی ژێر درکەکان، گەشانەوەی گیا، دەرکەوتنی پەلکەزێڕینەی پاش بارینی بارانی زۆر، کە تۆزێ بەرەو پیری ڕۆیی مانگە شەو خۆش بوون، بەرهەمی گوڵ، چنور، گوڵە مێلاقە، شەنگە بێرە، ئەم جۆرە شتانە دەگەیەنێت.

کە جوانی بەهاری ئەم کوردستانەی پیشان داوە.

*بەڵی، لە دوای ئەو وەسفە جوانەی کە کردت بەسەر بەهارا ئەوەمان دەخاتەوە یاد کە داوا لە جەنابت بکەین بۆ خوێندنەوەی هۆنراوەیەك لەسەر وەرزی بەهار.

ڕەز

1962

بەهار.. ئەی مەی ئەڵوەن و سادە
نەتدیوە پەترۆی پیاڵەی بادە..!
جەستەکە شەنگە، هەناسە سوارە
سەروڕی (لەپە)، دڵ بریندارە
هەناسە ڕەشە، هەست پلیشاوە
بانگ لە بەربین و قوڕگا خنکاوە
پێست بەسەر ئێسکا قرچ هەڵگەڕاوە
لەشە، جنراوە.. سەرە بڕاوە
لە کوێیە شەراب لە کوێیە شەراب
بۆ لە ئێمە بوو بە ڕێچکەی سەراب..؟!
ئەبێ لە کوێ بێ بۆن و بەرامەی
ئەو ڕەنگە ئاڵ و ئەو تفتە تامەی
ئەبێ لە کوێ بێ درەوشەی سووری
ڕووناکی تیشك و بڵێسەی دووری
وا دیارە هەڵپە و ئاوات و ئۆخەی
ئەبێ بیەینە پەنا شوشەی مەی..!
ئەی گەردن ڕەوان وێنەی نازداران
ساف هەر وەك نیگای چاوی خوماران
بێگەرد هەروەکو دەروونی مەردان
بێخەوش وەك گوڵی سای پەنا بەردان
لە کوێیە شەراب لە کوێیە شەراب
بۆ مەزەی، شەوا؛ گیان بوو بە کەباب..!
وا دیارە هەڵپە و ئاوات و ئۆخەی
ئەبێ ببەینە پەنا کووپە مەی
سەبوو.. ئەی کانگای بیری ئەفلاتوون
پیاڵە و شووشە وا بوون بە هەپروون
وڕن.. هەروەکو ئەستۆی ناڵەبار
خاشن.. بە وێنەی زنجیری زۆردار
ونن.. بە وێنەی تۆزی با بردوو
تەفرن.. بە وێنەی تۆزی بابردوو
لە کوێیە شەراب ئەوا تاسەی مەی..؟
هەست نوقوم ئەکا وەك زەریای بێ پەی..

ئەی داری مەمك پڕ لە شیلەی ئاڵ
كۆرپەی مێشكی برسی شیری تاڵ
گڕۆزە بۆ یەك مژ و یەك دڵۆپ
بۆ شەوی خەیاڵ ببێ بە گڵۆپ
ڕۆشن كا دونیای هەستی من هەروەك
چرایە بۆ ناو (بیرێكی) نووتەك..!
ئای كێ بێ بانگ و هاوار و پەیام
بگەیێنێتە گوێ گۆڕی خەیام
بڵێ.. هەی سەرشێت كوشتەی گڕی تەڕ
گەرتێتا ماوە یەك تۆز نرخ و فەڕ
تۆ.. لەسەرباكەی شووشەكەی شكان
لەگەڵ خودادا كردت بە زۆران
هەڵسە بەرەو ئەم ناوە هەڵتوونێ
نەك شووشە شكا و ا ڕەز ئەسووتێ
سروشت بە پێچە خوار و چەپ گەردە
لە جێ پێ ئاو بێ ڕەقەن و بەردە
لە جێ‌یێ زەوی نەرم و هەڵۆڵ بێ
ئەبێ خوڕەی ئاو تۆزێ دەهۆڵ بێ..!
ئەگینا شەراب لە مامۆستای ماف
بۆ ئەگەیشتە ئەوپەڕ قولەی قاف
قاتی شەرابە گیانی ئیفلاتوون
سەردەركە هەتا نەبووی بە مەیمون
بەرەو مەڵبەندی كوردستان ڕەوتێ
نەك كووپە شكا وا ڕەز ئەسووتێ

*مامۆستا تۆ وەك خوێنەوارێك گۆڤار و ڕۆژنامەكان دەخوێنیتەوە. گەلێ ڕەخنەگریشمان هەیە كە لە بارە هەمەچەشنەكانی ڕۆشنبیریدا ڕەخنە دەگرن و بڵاوی دەكەنەوە، نازانین تۆ وەكو شاعیرێ لەم ڕووەوە چی دەڵێی.

ڕەخنە، تا ئێستا هەرچیم بیستووە، كە خەڵك گوتوویەتی چی بە ڕادیۆ و چ لە مقابەلاتی تەلەفزیۆنی و چ بە بڵاوكردەوە و بە نووسین لە گۆڤار و ڕۆژنامەكاندا شێوەیەك لەسەرو پۆتەڵاك دانە، شێوە هێرشە، شێوە شیكردنەوەیەكی ناڕاست و ناهەموار، ڕەخنە مانای ئەوە نییە كە هەرچی لای خراپەیە بەلای تۆوە دەریبخەیت، ڕەخنە یانی لە پێشدا لای باشی شتەكە دەربخەیت، لای پاكی دەردەخەیت، لای رووناكی دەردەخەیت، ئینجا دێیتە سەر ئەوەی ئەمەیان كەمە، ئەمە ناتەواوە، ئەوە دەبوایە وابووایە، دەرخستنی لای باش بەرامبەر بە دەرخستنی لای كەموكوڕی، ئەمەیە كە پێی دەگوترێ ڕەخنە.

*باشە مامۆستا حەزت لە چ ڕەنگێكە؟

حەزم لە ڕەنگی سوورە.

*بۆچی؟

بۆچی حەز لە ڕەنگی سوور ئەكەم؟ بە تایبەتی سوری ئاڵ، قەسیدەیەكی تازەم گوتووە عینوانەكەی "زستانی ئاڵ"ە، ئەگەر یارمەتیم دەدەیت چەندم توانی لێی دەخوێنمەوە.

## زستانی ئاڵ

دڵ ئەسوتێ، مەشخەڵێكە گڕگرتوو
وەكو پوشی خەرمانی بەربا كەوتوو
پاشماوەكەی چەواڵێكە بێ سوتوو
كانی خوێنە، وشك ناكات وەك مردو
ڕوو لە كوێ بكەین كوێ بەرینە بۆ ڕاوێژ
بێ كرمەیە بێ خرمەیە، كاتی چێژ
هیچ نایگاتێ نەك تفەنگی تۆپهاوێژ
چاو خول ئەخوا بە چوارلادا گێژووێژ
بەرەو كۆتەڵ ڕازی تازەی زستانە
لێو ڕەنگكردن جامخانەكەی دوكانە
هەنار لقی بەسەر سنگا پەخشانە
ئاخ شاخەكان دەست و پەنجەی سەرشانە!
دەنگی هەنار وەك دڵۆپی گریانە
لەرەی سنگی زرەی دەست و فنجانە
دڵ ئەسمڕێ تیر هاوێژیش چاوانە
لێو ڕژاوە لەسەر پشتە خومخانە
ڕوو لە كوێ بكەین توێشووی ڕێمان فرمێسكە
توێشەبەرەی جەواڵێكی پڕ ئیسكە
داڵ هەڵگیرسا پشكۆی ژێری تامێسكە
گورج لێئەدات خێرا خێرا وەك تێسكە
زستانی ئاڵ كێ هاوڕاز و هاوڕێیە
كێ بەرهەمی جێ چنگی كۆنی پێیە
كێ دەماری نەك خلیچكە وەك ژێیە
ڕێگابڕە كەمەر توندە بە پێیە؟
كێ هاوڕازە، هاونیازە، هاودەردە
كوڕی شەوە، ڕۆڵەی ڕۆژە، نەبەردە
گڕگرتووە نەك سووتاوە وەك بەردە
پشكۆ خۆرە ئاگر هاڕە هام فەردە
كێ شین پۆشە شەوە بەرگە، داماوە
جگەر گومە ئێسقانی داكرماوە
سپێنەی چاو جۆگە خوێنی تێزاوە
هاوڕێی منە بێتە پێشێ بەملاوە
كێ هاوشانە، هاوشەقاوە سنگ پانە
پێست ئەستوورە بۆ لێقەومان قەڵغانە
بیری تیژە وەك نەشتەری دەبانە
هاوڕێی منە دەم بنێتە ئەم گیانە

زستانی ئاڵ، زستانی ئاڵ، کرێوە
داپۆشیوە، ئەو بەردانە، ئەو کێوە
بەفرماڵ کوا بۆ ڕێ بڕان لەو چێوە
کوێ بەرزییە ئامێتەیە، نشێوە
سەردەرکردن لەلای هەندێ پرسیارە
سەربەرزێتی ژانهێنەر جەخارە
گوێ ئاخنین بارانی ژێر دەوارە
لرف لێدان کراوەیە بە بارە
ئەی تیشکی ڕۆژ وەی زەردەی شاخەکانم
خۆ من کوردم هەر هیچ نەبێ ئینسانم
چاوکراوەی گوڵاڵەی گردەکانم
پەیمانم بێ یان گیان یان کوردستانم

*مامۆستا وشەی ڕاستی چییە؟

وشەی ڕاستی ئەوەیە کە لە ژیانتا ئەملاوئەولا نەکەیت، ڕێک بڕۆیت خۆت لە دەروونی خۆتدا بەرامبەر بە خۆت و کەسوکارت ڕاست بیت، بەرامبەر بە کۆمەڵەکەت ڕاست بیت، نوقورچی لێ نەگریت، پشتی تێنەکەیت، سنگی تێبکەیت، لەگەڵیا ڕاستگۆ بیت و بە ڕاستی بڕۆیت لەگەڵیا، ئەوەیە وشەی ڕاستی.

*ئەی وشەی دڵ چی دەگەیەنێت.

وشەی دڵ ئەوەیە کە تۆ خۆت و نەتەوەکەت و نیشتمانەکەتت خۆش بوێ، ئەوە وشەی دڵە.

*مامۆستا جارێکی تر دێینەوە سەر بەرهەم و بەهرەکانت، دەڵێین دوا دیوانت چی بوو کە کەوتە بازاڕەوە؟

دیوانی شیعر وەکو لە پێشەوە باسم کرد، هەرچەندە هەندێ هەڵەی چاپی تێدایە، وە ئەو کەسەی کە پێی دەڵێن نازم دڵبەند ئەو سەرپەرشتی دەکرد ئاگای لە ڕاستکردنەوەی هەڵەکان بوو، بەڵام بە داخەوە ئەڵێم لەگەڵ ئەوەشدا لەوە ئەچێ کەبە جان و جگەر خەریك نەبووبێ بۆیە هەڵەیەکی زۆری تێدایە، خۆ ئەگەرەکو بەڕێکی بخوێنرێتەوە لە مەبەستی یەکەم شیعر تێبگەیت خۆت بە سروشتی هەڵەکانی ڕاست دەکەیتەوە، بەم زوانەش وا بزانم مامۆستا عەبدوڵڵا ئاگرین پێشەکییەکی نووسیوە بۆ دیوانی شیعرەکە، بە کوڕاسێکی بچووك هەڵەکان ڕاست دەکاتەوە و بڵاوی دەکاتەوە.

*مامۆستا، ئایا گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان بە بەردەوامی بەرهەمەکانتان بۆ بڵاودەکەنەوە و هەقیان پێداون یاخود نەء.

نەخێر گۆڤار و ڕۆژنامەکان لایەنی ڕاستی و ڕەوانی و جێگا خۆگرتوویی هەموو کەسێ، چ شاعیر بێت، چ ئەدیب بێ، نووسەر بێت، نەیداوە.

کۆمەڵی خەڵك دەبینی کە قەڵەمیان بە دەستەوەیە تەمەنیشیان منداڵ نییە، بەڵام ئێستا شتێکی وایان بۆ خولقاوە کە بتوانن بنووسن و دەربڕن یەکێك دەگرن بە دەست قەڵەمەکەوە بۆی لەسەری بنووسن. بنووسن، بنووسن بێ بڕانەوە، کێیە ئەوە، ئەمە کەسێکە دۆستیەتی، کەسوکاریەتی، ڕابردوویەکی لەگەڵا هەیە، یان یەکێ کارێکی کردووە بۆئەوەی لەگەڵیا بڵی بێئەوەی لایەنی ڕاستییەتی لە مەسەلەکەدا ڕوون بکاتەوە، ئەیکات بە کێوی پیرەمەگروون. ئەگەر یەکێکیشی مەبەست نەبێ یاخودترووسکەیەکیان بۆ دەرخستبێ کە لێی بدەن بە سەروگوێلاکیا دێتە خوار، تا ئێستا خۆم نەمدیوە حەقیقەتی شاعیرێ یان نووسەرێ بە تەواوەتی ڕاست کرابێتەوە، چ لە گۆڤارەکاندا یان لە ڕۆژنامەکاندا.

مامۆستا، وەکو شاعیرێکی گەورە کە چەندەها ساڵە شیعر دەنووسی، ئێستا تۆ بویتەتە مامۆستای ئەو شاعیرە لاوانەی کە تازە پێدەگەن، ئەمانەوێ ئامۆژگارییەك یان وتەیەك بەم شاعیرە لاوانە بڵێیت.

ئەگەر مەبەستت لەوەیە کە ئەوەی ئێستا لاوەکان دەینووسن پێی بگوترێ شیعر، من پێی ناڵێم شیعر.

*بەڵێ بە لاوەکان دەڵێم.

ئەزانم مەبەستەکەت ئەمەیە، وەکو گوتم ئەمانە بە شیعر نازانم، چونکە شیعریش وەکو هەموو شتێکی تر مومەیزاتی هەیە، لەسەر تەلەفزیۆن ڕوونم کردۆتەوە، جارێکیشیان لە پەیوەندییەکی وابزانم ڕادیۆ بوو، تۆماریان کرد و بڵاویان کردەوە، نووسیویشمە، لە چەند کۆبوونەوەیەکی ئەدەبیشدا گوتوومە، شیعر مومەیزاتی تایبەتی هەیە، دەبێت مەوزوعێ بێت، قافیەی هەبێت، وەزنی هەبێت، ئەنجامێ بدات بە دەستەوە بەڵام وەزنی نەبێ و قافیەی نەبێ و مەوزوعێکی موەحەدی نەبێ و ئەنجامێکیش نەدات بە دەستەوە، ناڵێم ئەدەب نییە، ئەدەبە بەڵام پێی ناگوترێ شیعر. دووبارەشی دەکەمەوە پێی ناگوترێ شیعر، چونکە وەکو گوتم شیعر مومەیزاتی خۆی هەیە، مومەیزاتەکانیش ئەوانەن کە ژماردمن: وەزن، قافیە، مەوزوع، نەتیجە بە دەستەوەدان. مەوزوعێ بێت عەرز و تەحلیلێکی تیا بێت، موشکیلەیەك حەل بکات و ئەنجامیش بداتە دەست. لەبەرئەوە ئەوانەی کە دەستیان داوەتە قەڵەم و دەنووسن، ئەوەی کە دەیڵێین من ناڵێم ئەدەب نییە، هەرچی شتێکی پێ دەڵێیت پەخشانە مەنثورە گرنگ ئەوەیە شیعر نییە، بەڵام ئەدەبە، ئەگەر یەکێکی هەڵکەوتووی تیابێت چاوەڕێی لێ بکرێت منیش دەڵێم هیوای دواڕۆژێکی زۆر چاکی بۆ دەخوازم. ئاواتەخوازم پێش بکەوێ. سارد نەبێتەوە.

*مامۆستا دیلان هەندێ شاعیری کورد، شیعری بێگانەیان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، ئایا ئەو شیعرە ئەو تام و چێژەی دەمێنێ کە شاعیرە سەرەکییەکە خۆی گوتوویەتی.

نەخێر نایمێنێ، وەرگێڕان لە زمانێکی بێگانەوە، بۆ زمانی کوردی دەبێت ئەوەندەت دەسەڵات هەبێ کە بتوانی ئەدەبیەن بە وشەکانی، بە مەوزوعەکەی بگەیت، بە ئەنجامەکەی بگەیت،

چونکی هەموو کەسێ دەڵێت وەرگێڕان لە دانان زۆر گرانترە، زۆر ستەمترە، دەبێت خۆتی تیا هیلاک بکەیت. لەبەرئەوە هەتا ئێستا ئەو شتانەی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی بە تایبەتی لە زمانی ئەوروپاییەوە چ ئینگلیزی بێت چ فەرەنسی بێت چ هەر زمانێکی تر بێت تا ئێستا بە چاکی و بە باشی وەرنەگێڕدراوە.

*مامۆستا، نازانم گوێ لە ئێستگەی کوردی دەگریت یان نا؟

کەم

*باشە هەرچەندە دەڵێیت کەم، پێشنیارت بۆ پێشخستنی بەرنامەکانی ئێستگەی کوردی چییە؟

ناڵێم پێشنیار، بەڵام ئەمەی کە ئێوە تازە دەستتان داوەتێ ئەم چاوپێکەوتنە ئەدەبی و موسیقی و دەنگخۆشی، ناڵێم گۆرانی دەڵێم دەنگخۆشی بڵاوی بکەنەوە شتێکی جوان و خۆشە. دڵی پێ خۆش دەبێت، ئەویش یەکێکە لە لایەنەکانی ئەوەی کە نەتەوە دروست دەکات، بەڵام نەك هەمووی بکەیت بە دەنگخۆشی و بە گۆرانی، نەخێر، گۆرانی کە بە دەنگی خۆش دەگوترێ، لایەنێکی پێکهێنانی نەتەوەیە، ناتوانی ئەوە ون بکەیت، ئەگەر بشتەوێت نەتەوەکەت پێش بکەوێت دەبێت وەك چۆن زمان و ئەدەب و عیلم و قەوارەکەی پێش دەخەیت ئاواش مۆسیقا و گۆرانییەکەی پێش بخەیت.

*باشە مامۆستا بە نامەکانی تەلەفزیۆنی کەرکوکت بە دڵە.

ماوەی دوو سێ ساڵێکە بەرەو پێشەوە دەڕوات، بە تایبەتی جۆرێك لە چاوپێکەوتنی ئەدەبی و عیلمی و وەرزشی دەکەن، بۆیە بەرەو پێشەوە دەڕوات و جێگەی سوپاسە..

*باشە مامۆستا گەلێ بۆنە و ئاهەنگ لە شارەکانماندا هەیە، دەڵێن بەشداری کۆڕی شیعریت کردووە لە دەرەوەی شاری سلێمانی.

نەخێر تا ئێستا نەچووم. بەڵام لەم ماوەیەی پێشوودا، هەرچەندە ناساغیش بووم، نەخۆش بووم، پێیان گوتم و هاتن بۆ لام، لەگەڵ دوو سێ برادەری تردا یەك دوو کۆڕی شیعری هەبوو، شتێکی باش بوو، ئاواتەخوازم بەردەوامیش بێت.

باشە مامۆستا هەروەکو دەڵێن هەستی هونەرمەند ناسکە، بەڵام وابزانم هەستی شاعیر لەو ناسکترە، لەبەرئەوە حەزدەکەین پێمان بڵێی، شەوان کە لە ماڵەوە دادەنیشی گوێ لە چی دەگریت.

من خۆم گیانیم، کە ئەڵێم گیانی یانی رۆحیم، حەز لە مۆسیقای فارسی دەکەم، نەك حەزی لێدەکەم بەڵکو چۆتە خوێنمەوە. چونکی ئەوە شتێکی ساغ کراوەیە، تەنانەت تورکیش، سەیری مەقامەکان بکە و ناوی مەقامەکان، ناوەکانی ئاشکرایە کە چین، بۆچی؟ چونکی ئەوان لە مۆسیقادا پێشکەوتوون و ئەوە شتێکە کە ناتوانی پشتی بخەیت، ناتوانی بە پێچەوانەوە لێکی بدەیتەوە. لەبەرئەوە هەر ئاوازێکیان کە کاربکاتە سەر ڕەگ و دەمار و بتهەژێنێ بۆئەوەی خەفەتت پێ بخوا نەك بتخاتە پێکەنین، فرمێسکت پێ برژێنێ. نەك بتخاتە پێکەنین. حەز لەو جۆرە مۆسیقایە دەکەم.

*مامۆستا هەروەکو لە پرسیاری پێشوودا گوتمان شاعیر حەزی لە مۆسیقایە، لەبەرئەوەی مۆسیقا هێواشە و سەرنجی شاعیر زیاتر ڕادەکێشێ، بەڵام ژمارەیەکی کەم لە شاعیران حەز لە گوێگرتن لە گۆرانیش دەکەن. نازانین تۆ حەزت نەکردووە لە دەنگی گۆرانیبێژێ یا بڵێین گۆرانیبێژە کۆنەکان.

نەخێر حەزناکەم گوێم لە هیچ مۆسیقا و گۆرانییەك بێت، قەت حەزم لێ نەکردووە، بەس حەزم کردووە گوێم لە شیعر بێت، وەکو تایبەتی خۆم، من باسی خەڵك ناکەم.

*مامۆستا ڕات چییە لەسەر ئەو دەنگخۆشانەی کە شیعرەکانی تۆیان کردووە بە گۆرانی؟

پیرۆزباییان لێ دەکەم.. پێشم خۆشە.

*باشە هەقی شیعرەکانی تۆیان داوە.

هەموویانم بە تەواوی گوێ لێ نەبووە. با گوێم لێیان بێ جارێکی تر کە یەکتریمان بینی ئەم پرسیارەم لێ بکەنەوە، وەڵامت دەدەمەوە.

*مامۆستا دوا وتەت؟

زۆر سوپاسی تۆ دەکەم کە هیلاك بوویت، تۆ ئەگەر هەستێکی نەتەوەپەرستیت نەبێت ئەم ڕێگایە ناپێویست و خۆت ماندوو ناکەیت و بێت ئەم جۆرە چاوپێکەوتنانە بکەیت. هەر هیچ نەبێ خۆت وەکو کورد پیشان دەدەیت کە ئەم میللەتەت خۆش دەوێ، لەبەرئەوە سوپاست دەکەم.

ئێمەش سوپاسی بەڕێزت دەکەین.

**تێبینی:**

ئەم چاوپێکەوتنە ڕادیۆییە کە دواین چاوپێکەوتنە لەگەڵ دیلاندا سازدراوە ساڵی 1988 بەرنامەی "ئێوە و ئەم هونەرمەندە"ی ڕادیۆی کوردی بەغداد لەگەڵ دیلاندا سازی داوە، ئێمەش لە ڕێی "دکتۆر دڵشاد عەلی"یەوە کاسێتی چاوپێکەوتنەکەمان دەستکەوت و ئەم بەشەمان لێ ئامادە کردووە و بڵاومان کردەوە.

**پەراوێز:**

1–ئەم شیعرە بۆ مامۆستای خوالێخۆشبوو (سەردار کەمال مەولود) وتراوە.

2–ئەم شیعرە ساڵی 1987 نووسراوە.

**نامەیەکی دیلان بۆ دکتۆر دڵشاد عەلی**

٢٦/١٠/١٩٨٤

برای دڵسۆزم کاک دڵشاد

ڕۆژتان باش

بەدڵ دەستەکانت دەگوشم. داوای لەشساغی و دوور لە ئازار بوونت لە خوا ئەکەم.

ماوەیەکە ئەوم ویست بە دیدارت شاد بم ڕێک نەکەوت

کاکە ..... چەند تێبینیەکی خۆم دەربارەی کتێبەکەت ئەخەمە بەر ئەم کاغەزەکە ڕاستی. نالێم بەلای منەوە، چونکە دەربارە ئەڵێم ڕاستی.

١. ئەبوو پێش نووسینی کتێبەکەت خۆت بدابایە بۆ ئەوەی لە شیعرە ڕەخنەگیراوەکانت بگەیشتیتایە (چونکە نووسراوەکەی نووسراوەکە مەبەستی چی بووە لە نووسینی).

٢. جیاوازی ساڵی (١٩٥٤) لەگەڵ ساڵی (١٩٦٨) (١٩٧٠) (١٩٧٦) لەگەڵ ساڵی (١٩٧٨) .. هتد...

٣. بەتایبەتی (١٩٧٠ تا ١٩٧٤) ئەبێ بم بینی تێبگەیت مەبەست چییە لە بڵاوکردنەوەی ئەو شیعرانەی ئەو ساڵە ئەوەی لە تۆ ناوت ناوە (پاشەکشێ).

٤. بۆ نموونە شیعری (چیرۆک) گاڵتەکردنە بە شیعری بێ وەزن و بێ قافیە وە هەر لە دووکانەکەی کاکەی فەلاح دانووسیم.

کاکە بم بینی زیاتر زەقی ئەکەمەوە چونکە ناوی تەرازووەکە ڕاست ئەکەمەوە.

ئیتر داوای پێشکەوتنی زیاترت ئەکەم لە خوا

هەر بژیت و لەشت ساغ بێت

براتان

دیلان